سەرچاوەی ئەم کتێبە
چمدان، بزرگ علوی
چاپ چهارم: ۱۳۸۷ ( ۲۰۰۸ )
مؤسسه انتشارات نگاه

ناوی کتێب: جانتـــــا ( کۆ چیرۆك )
نووسەر: بزورگی عەلەوی
وەرگێڕ: حەمە کەریم عارف
تایپ: رزگار حەساری
هەڵەچن: گۆڤەند محەمەد
چاپخانە: کارۆ
چاپی یەکەم: ۲۰۱۳
تیراژ: ۵۰۰ دانە
لە بڵاوکراوەکانی یەکێتی نووسەرانی کورد-لقی کەرکووك ژمارە ( ۲۱۲ )

# پێڕست :

# پێشەکی

**حەمە کەریم عارف**

بزورگی عەلەوی لە ساڵی ١٩٠٤دا لە بنەماڵەیەکی بازرگانی دەوڵەمەند و رۆشنبیر و مەشروتەخواز هاتووەتە دنیا. حاجی سەید ئەبول حەسەنی بابی گەنجێکی بەهرەمەندو ئەهلی زەوق و کەماڵو ئازادیخواز بووە لەگەڵ نەسرۆڵلا ئەخوی دا سەفەری پاریسی کردووەو لە مەشروتەخوازانی دڵ گەرمەکان بووە، لە گەرمەی جەنگی جیهانی یەکەمدا ئاوارە بووەو کاتێ بەغداو کرماشان لەلایەن ئینگلیزەوە گیراون خۆی گەیاندووەتە بەرلین و ساڵانێکی دوورو درێژ لەوێندەر ژیاوەو هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە.

بزورگ بچووکترین منداڵی بابی بوو، لە خوێندندا زیرەك بوو، پاش ئەوەی خوێندنی فێر بوون و پەروەردەی لە ئەڵمانیا تەواو کرد، لە ساڵی ١٩٢٨دا بۆ ئێران گەڕایەوەو ماوەیەك لە شیرازدا مامۆستایەتی کرد. لە ساڵی ١٩٢٨دا ئاشنایەتی دەگەڵ سادقی هیدایەتدا پەیدا کردو هەردووکیان کەوتنە سەر ئەو بیرەی کە چیرۆك دەربارەی ئەو وڵاتانەی کە پەلاماری ئێرانیان داوەو زەرەرو زیانیان بە شارستانیەت و کەلتووری ئێران گەیاندووە بنووسن. پاشان شیراز زادەی پرتەویش هاتە ریزی ئەوانەوەو بەسێ قۆڵی کۆچیرۆکێکیان بڵاوکردەوە بە ناوی ئەنیران (واتە روناکی بێ کۆتایی، ناوی خواوەندێکە لە دیانەتی زەردەشتیدا... ح.ع) کە بریتی بوو لە: (سایەی مەغۆل –هیدایەت، دەربارەی هێرشی ئەسکەندەر بۆ سەر ئێران–ش پرتەو، دیو– عەلەوی، دەربارەی هێرشی عارەبە..

هەر لەم سەرو بەندەدا عەلەوی (خات ئورلیان)ی شیللەری پاچڤەی فارسی کردو هیدایەت پێشەکی بۆ نووسی،و بەرە بەرە تێکەڵاویان زیاتر بوو، پاشان (مینەوی، فەرزاد، نوشینو مین باشیان)ش پەیوەندیان پێوە کردن و بە هەموویان لە ساڵی ١٩٣٠دا، لە تاراندا گروپی رەبعەیان دامەزراند. ئەم گروپە رەمزو نوێنەری ئەدەبیاتی تازەی ئێران بوو و لە راستیدا بەرانبەر بە گروپی سەبعە (حیکمەت، تەقی زادە، ئیقبال و قەزوینی... هتد) دامەزراو رکابەری وان بوو، گروپی سەبعە دەستیان لە سیاسەتدا هەبوو و نوێنەری کۆنەپەرستیەتی ئەدەبی بوو. گروپی رەبعە کە بریتی بوو لە کۆمەڵە گەنجێکی پێشرەو وپێشەنگ لە بیری ئەوەدا بوو کە کەلتوورێکی تازە لە کەلتووری کۆن و نوێی ئێران دەگەڵ کەلتووری ئەوروپایی دا پێك بێنێ. هەڵبەتە هاوکاری هیدایەت، عەلەوی، فەرزاد، مینەوی، مین باشیانو نوشین... کە هەر یەکەیان لە بوارێکی کەلتورو هونەردا شارەزا بوو، بەرەنجامێکی فرە بە پیت و فەڕی لێکەوتەوە.

بە گوتەی مینەوی ئەم گروپە خۆی لە خۆیدا جۆرە بەرپەرچدانەوەیەکی گروپی سەبعە بوو کە هەر گۆڤارو بلاڤۆك و رۆژنامەیەکی فارسیت دەبینی، بەرهەمی ئەوانی تێدا بوو.. هەڵبەتە هەم ئەوان لە حەوت کەس پتر بوون و هەم گروپی رەبعەش لە چوار کەس پتر بوون. رکابەری و دژایەتی و رەخنەو رەخنەکاری توندیشیان لە نێوان هەبوو، بەلام دژایەتی گروپی سەبعە کە مینەوی دەڵێت هەزار روو و هەزار دڵیان هەبوو، بۆ گروپی رەبعە لەوە تێ نەپەڕی کە کار بەدەستانی حکومەتی راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ تاقیبیان بکەن.

هەڵبەتە دەبێ ئەوەش بگوترێ کە دۆستایەتی دەگەڵ سادقی هیدایەت لەلایەك و دکتۆر تەقی ئەرانی لەلایەکی دی کاریگەرییەکی زۆری لەسەر ژیانی عەلەوی هەبوو. لە رێگەی هیدایەتەوە پەی بە قولایی ئەدەبیات بردو لە رێگەی ئەرانییەوە کەڵکەڵەی چالاکی رامیاری کەوتە سەر، هەڵبەتە ئەم دوو لایەنە پاشان سەرانسەری ژیانی عەلەویان داگیر کرد. دیارە لە بواری دیکەشدا جێ دەستی عەلەوی دیارە کە پاچڤەو لێکۆڵینەوەو توێژینەوە لە جوملەی ئەو بوارانەن.

*　　　*　　　*

هیدایەت و عەلەوی‌و فەرزادو... زۆریان کەیف بە سیاسەت نەدەهات، بەلام چونکە ئێران لە قۆناغی قەیران و ئاستەنگێکی سیاسی دژواردا بوو، و دەسەلاتی دیکتاتۆریانەی وەخت، لە هەوڵی سڕینەوەی شوێنەوارەکانی مەشروتەو لە بەین بردنی هەر جۆرە ئازادیەکدا بوو: و ئێ خۆ زمانی بەرەی رۆشنبیرانش لە کۆت‌و زنجیر نادرێ بۆیە تەحەمولی دکتاتوریەت‌و دەرهاویشتەکانی زوڵم‌و زورداری بۆ رۆشنبیرانی ئەوروپا دیتووی وەکو هیدایەت‌و عەلەوی‌و دکتۆر تەقی ئەرانی یەجگار زەحمەت بوو. هیدایەت بە سروشت کەسێکی خەمین بوو و لە بیری ئەوەدا بوو ئێران بەجێ بێڵێ. دکتۆر ئەرانی کە لە ئەڵمانیادا ئاشنایەتی دەگەڵ مارکیسزمدا پەیدا کرد بوو، پێی وابوو جگە لە خەبات هیچ چارێکی تر نییە.. ئیدی لە گەرمەی ئەم قەیرانە سیاسیانە دابوو کە عەلەوی تێکەڵی دکتۆر ئەرانی بوو. عەلەوی بە خۆی لەم بارەیەوە دەڵێت: "... دام‌و دەزگاکانی دەسەلاتدار ئێمەیان وەکو پەنجاو سێ نەفەری کۆمۆنیست ناساند، لە کاتێکا من کاتێ کەوتمە زیندان تازە سەروکارم دەگەڵ فەلسەفەی مارکسیزم دا پەیدا کرد بوو، یانی لەگەڵ دکتۆر ئەرانی دا دادەنیشتم‌و کتێبی (سەرمایە)ی مارکسم دەخوێندەوە. بێ ئەوەی چ حیزبێك لە گۆڕێ بێ چەند نەفەرێك بە نیازو مەبەستی شارەزا بوون لە فەلسەفەی مەتریالیزم لە دەوری یەکتر خڕ بوو بووینەوە. رەنگە ئەمە ئامیانێ بووبێ تا دوایی بمەێت.. من یەك لەوانە بووم کە لە نووسینی گۆڤاری (دنیا)دا هاوکارو شەریك

بووم.. تاقە خاڵی هاوبەشی ئێمە، پەنجاو سێ نەفەر، چوار دیواری زیندان و ئەو گوشارو عەزابە بوو کە پێکڤە تەحەمولمان دەکرد".

گروپی پەنجاو سێ نەفەر بەڕابەرایەتی دکتۆر ئەرانی لە بوارەکانی سیاسەت و زانست و ئەدەب دا کاری دەکرد و زیاتر گروپێکی پێشکەوتووخواز بوو. مەلەکی، بەهرامی، یەزدی، ئەنوەری خامەیی، قدوە، ئیحسانی تەبەری، ئیرەجی ئەسکەندەری، رادمەنش و... لە دەوری یەك خڕ دەبوونەوەو کتێبیان دەخوێندەوەو میتۆدێکی مارکسیستیان هەبوو، گۆڤاری "دنیا" ئۆرگانی بیرو ئەندێشەکانی ئەوان بوو، لەوێدا مەتریالیزمی دیالکتیك و هزرێن زانستی دەخرانە بەر باس و لێکۆڵینەوەو گەنگەشەی لەسەر دەکرا.

دکتۆر ئەرانی (١٩٠٢- ١٩٣٩)، بەخۆی پزیشك بوو،دکتۆرای فەلسەفەو کیمیای لە زانستگەی بەرلین هێنا بوو، لە ساڵی ١٩٣٠دا بۆ ئێران گەڕایەوەو لە ساڵی ١٩٣٣دا گۆڤاری (دنیا)ی دەرکرد. لە ساڵی ١٩٣٧ بە تۆمەتی چالاکی سیاسی گیراو پاش بەرگریی و داکۆکیەکی مەردانەو رەندانە لە دادگای تاوانەکانی تاران، حوکمی حەپس و زیندانی دراو لە ساڵی ١٩٣٩دا لە نەخۆشخانەی زیندانەدا لەلایەن کار بەدەستانی ساواکەوە شەهید کراو زۆر کاری زانستی لەپاش بە جێماوە لەوانە بنەماکانی زانستی فیزیا کە چوار بەرگە، بنەماکانی کیمیا کە چوار بەرگە، سایکۆلۆژی، عیرفان و بنەما مەتریالیەکان.. هتد. دکتۆر ئەرانی رۆشنبیرێکی گۆشەگیرو دوورە پەرێز نەبوو، باوەڕی وابوو کە ئەگەر گەندەڵی کۆمەڵگەی گرتەوەو کۆمەڵگە بە گەندەڵیان لەوتا، ئیدی تاك چەند خۆی لە کاروباری کۆمەڵگە دوور بگرێ بێفایدەو چونکە بیەوێ و نەیەوێ گەندەڵیەکانی کۆمەڵگە بەرۆکی ئەویش دەگرێ.

*            *            *

هەڵبەتە هەندێ لایەنی خەبات و داکۆکی دلێرانەی دکتۆر ئەرانی، لە بواری رابەریکردنی خەباتی سیاسی و رۆشنبیریی و لە زیندان و لە دادگادا لە هەندێ بەرهەمی عەلەویدا، وەکو (پەنجاو سێ نەفەر) و (چاوەکانی)دا رەنگی رەنگی داوەتەوە، ئەمەش بەڵگەو نیشانەی ئەوەیە کە زۆر دڵبەندو شیفتەی کەسایەتی تێکۆشەرو خەباتگێڕی ئەرانی بووە.

عەلەوی لە ساڵی ١٩٣٧دا لەگەڵ دکتۆر ئەرانی و گروپی پەنجاو سێ نەفەردا کەوتە زیندان و وەکو لە کتێبی پەنجاو سێ نەفەردا بە دیار دەکەوێ لە زینداندا ورەی بەرنەداوەو لە کاری خوێندنەوەو نووسین بەردەوام بووە. هەڵبەتە لە (ورق پارەهای زندان)دا وا دەردەکەوێ کە لە نێوان نا ئومێدی و ئومێدەواری دا لە هاتوچۆدا بووە. بە خۆی لەم بارەیەوە دەڵێت: "هیچ کاتێك تەسلیمی نا ئومێدی نەبووم، هەڵبەتە جاری وا بووە کە لە ساتێکدا نائومێد دەبووم،

بەڵام ساتێکی ڕەوتەنی و تیژ تێپەڕ، لە زنداندا قەناعەتی تەواوم لەلا بوو کە هەر دەگەڕێمەوە دنیای ئازاد". هەڵبەتە خۆیایە کە ساڵانی درێژی زندان بۆ هونەرمەندێکی دڵناسکی میناکی عەلەوی لە روندك و حەسرەتو داخو کەسەرو ترس بەدەر نەبووەو ئەمە لە چیرۆکی (عە فواتی گشتی)دا تا ئەندازەیەك رەنگی داوەتەوە.

لە شەهریوەری ١٩٤١دا دامو دەزگای دکتاتۆری هەرەسی هێناو مانگی دواتر عەلەویو هەڤاڵەکانی ئازاد بوون، ئیدی لەم قۆناغەدا شنەیەکی ئازادی هەڵدەکات، حیزبی تودەی ئێران دادەمەزرێو بەرهەمی عەلەوی لە پلاڤۆکان و چاپەمەنیانی حیزبی تودەی ئێراندا بەرچاو دەکەون. لە ساڵی ١٩٤٣دا گۆڤاری (پەیامی نوێ)ی ئۆرگانی ئەنجوومەنی پەیوەندییە کەلتورییەکانی ئێرانو سۆڤیەت بەسەر نڤیساری عەلەویو هاوکاری سەعیدی نەفیسی، هیدایەت، فاتیمە سەیاح،عیسا بهنام وکەریمی کەشاوەرز بڵاودەبێتەوە، گەلێك لە وتارو چیرۆکەکانی عەلەوی لەم گۆڤارەو گۆڤارانی (سخن و مردم)دا بڵاو بوونەتەوە. عەلەوی کە بە هۆی زندانەوە لە هیدایەت دوور کەوتبووەوە، دوای ئازاد بوون، جارێکی دی پەیوەندی لەگەڵ هیدایەتدا گرتەوە. هیدایەت لە ئەنجوومەنی سەرنووسەرانی سخن و پەیامی نوێ بوو.. هەر لە رێگەی ئەم گۆڤارانەوە بوو کە عەلەوی و ئیحسان تەبەریو خانلەری کەوتنە ناساندنی هیدایەتو هەڵسەنگاندنی هزرو بیریو نیشاندانی بایەخی بەرهەمەکانی.

چیرۆکەکانی سەرەتای عەلەوی، بە شێوازو ناوەرۆکێکی رۆمانسیانە نووسراون، کۆ چیرۆکی چمدان (جانتا) کە لە ساڵی ١٩٣٤دا چاپی یەکەم کراوە، چیرۆکەکانی هیدایەت وەبیر خوێنەر دێنێتەوە، خاڵی هاوبەشیان پتر لەم لایەنەوەیە کە عەلەویش میناکی هیدایەت، یەك لە ئەندامە چالاكو چەلەنگەکانی گروپی رەبعە بوو، کاریگەرییو سێبەری ئەدەبیاتی مۆدێرنی ئەوروپایان بە ئاشکرا پێوە دیارە.

عەلەوی لە دەرگای زمانی ئەڵمانییەوە چووەتە ناو کەلتوورو ئەدەبیاتی ئەوروپاییەوەو رۆشنبیرییو زانیارییەکانی خۆی لە یەکەم کۆچیرۆکی خۆیدا جەرباندووە.

عەلەوی پاش ناسینی دکتۆر ئەرانی و زیندان، ئیدی رووی کردە ریالیزمی کۆمەڵایەتی. هەڵبەتە زۆری خایاند تا بتوانێ لە کەمەندی رۆمانسیەت و وەسفی باری دەروونی رزگار بێت. هەڵبەتە ساڵانی ئاشنایەتی لەگەڵ ئەرانی و چوار ساڵ ئەسارەت لە زیندانداو هاونشینی لەگەڵ زندانیانێکدا کە هەر یەکێکیان لە چالاکان و هەڵسوڕاوانی سەرەکی بزووتنەوە کۆمەڵایەتیەکان بوون، دیدو جیهانبینی (عەلەوی)یان گۆڕی، پاش ئەوەی لە زیندان ئازاد بوو، ئیدی ئەزموونی خۆی لەمەڕ زیندانەکانی رەزا شاهی لە دوو کتێبدا بە نێوی (ورق پارەهای زندان، و پەنجاو سێ نەفەر) بڵاوکردەوە. هەڵبەتە لە (ورق پارەهای زندان)ش دا کە لە ساڵی ١٩٤١دا چاپ بووە، چ شوێنەوارێکی ریالیزمی کۆمەڵایەتی بەدی ناکرێ، بەڵکو لە چیرۆکەکانی دوای شەهریوەری ساڵی ١٩٤١دا، وەکو چیرۆکی: "گیلە مرد، خائن..." کەشوهەواو هاماجی ریالیزمی کۆمەڵایەتی بەدی دەکرێ، دیارە ئەم هەوەڵین نموونانەی ئەدەبیاتی زندان بە

رادەیەك لە راپۆركاری و واریقاتنووسییەوە نزیكن كە زۆر زەحمەتە بتوانرێ لە ریزی ئەدەبیاتی پڕ ئەفراندندا دابنرێن.
زندان بەهرەو توانای چیرۆكنووسی عەلەوی خەفە نەكرد، بەڵكو پتری گەشاندەوە. ئەگەر هاوكاری ئەرانی نەبوایەو نەكەوتبایە زندان، بە هەمان رێچكەو رێبازی (چمدان)دا دەڕۆیی، ئیدی نە دەكاری بەرهەمی میناكی (نامەها، چشمهایش) دابهێنێ...چاپو بڵاوكردنەوەی (نامەها لە ١٩٥١و چشمهایش لە ١٩٥٢)دا بوونە مایەی ئەوەی كە ناوی عەلەوی وەكو یەك لە جدیترین پێشەنگانی ریالیزم بكەوێتە سەر زاران و شۆرەت دەربكات، هەر چەندە لایەنی سیاسی لە هەردوو بەرهەمەكەدا زۆر زاڵە، بە تایبەتی لە چیرۆكەكانی نێو كۆچیرۆكی (نامەكان)دا كەش و هەوای خەبات و ململانێی كۆمەڵایەتی ساڵانی پاش شەهریوەری ١٩٤١ بە تەواوی خۆیایە. عەلەوی لە چیرۆكی (گیلەمرد- گێلە پیاو)دا وەكو چیرۆكنووسێكی زەبەر دەست و هوشیار و بە ئاگاو زاڵ بەسەر كەرەستەكانی كارەكەی خۆیدا، خۆی دەنوێنێ و نێوەڕۆك و تیمەی دادخوازانەی چیرۆكەكە كردیە كارێك كە زۆر زوو نێو بانگ دەربكات و تاكو ئەمڕۆش، وێڕای ئەوەی كە پتر لە نیو سەدەی بەسەردا بوریوە، هێشتاش هەر دەخوێنرێتەوەو مایەی سەرنجە.
حیزبی تودەی ئێران، لە ساڵی ١٩٤٨دا، پاش پیلانی ئینگلیز (هەوڵی تیرۆری شا لە بەهمەنی ١٣٢٧)دا قەدەغە كرا، عەلەوی دەگەڵ سەرانی تری حیزبدا گیرا، بەڵام عەلەوی بە هیمەتی مەردانەی هیدایەت (رەزم ئارا، سەرۆكی سەركردایەتی سوپا كە دوای شا بە دەسەڵاتترین پیاوی سیاسی ئێران بوو -مێردی خوشكی هیدایەت بوو) بە خشكەیی و زوو بە زوو ئازاد كرا، كرِی و كپی و خامۆشی چەند ساڵێك بەردەوام بوو، تا لە ساڵی ١٩٥٠دا بزووتنەوەی نیشتمانی ئێران گەییە لوتكەو كەشو هەواو هاماجێكی سیاسی ئازاد هاتە ئاراوەو عەلەوی هەمدیس لە چاپەمەنیەكانی حیزب و لە پەیامی نوێدا كەوتە گوتار نووسین و چیرۆك بڵاوكردنەوە.. جا رۆمانی (چشمهایش- چاوەكانی) بەرهەمی ئەم قوناغەیە. ناوبانگی راستەقینەی عەلەوی لە (چاوەكانی)یەوەیە، ئەم یەكەمین رۆمانە واقیعییە فۆرم و بونیادێكی پۆلیسی و تیمە و نێوەڕۆكێكی كۆمەڵایەتی هەیە. زەمانی رۆمانەكە دەگەڕێتەوە بۆ قۆناغی دكتاتۆرییەتی رەزا شایی و خەباتی نیگاركێش و شێوەكارێك بە نێوی (ئوستاد ماكان) كە بە قسەی هەندێك ئەم كاراكتەرە لە ژیانی (دكتۆر تەقی ئەرانی و كەمال الملوك)ەوە وەرگیراوە.
عەلەوی هەوڵی داوە لەم رۆمانەدا مۆرك و رەنگی تۆخی سیاسی، كە لە چیرۆكەكانی كۆچیرۆكی (نامەها- نامەكان)دا بە تایبەتی لە چیرۆكی (نامەكان و خاین)دا بە تەواوی بونیادی ئەدەبیاتی زەدەدار كردبوو، لەم رۆمانەدا نەهێڵێت و بسرێتەوە كە تا رادەیەكیش سەركەوتووە، وێڕای خەبات و تێكۆشانی ئوستاد ماكان، واریقاتی ئاشقێنی و ئەڤینداری ئەوو فەرەنگێزیش بۆ خوێنەر سەرنج راكێشەو رەنگە لە واریقاتە سیاسیەكان پتر زەینی خوێنەر بۆ خۆی رابكێشێت. ئەمە جگە لەوەی كە فەرەنگێز پتر دڵبەند و شیفتەی هونەرەكەی ئوستاد ماكانە تا خەباتەكەی. ئەم ڤیانە بێگەردو ریسك ئامێزە بۆ فەرەنگێز جۆش و خرۆش

به ژیانی دەبەخشێت و خوێنەریش بە کتێبەکەوە دەبەستێ. بەڵام دوور کەوتنەوەی عەلەوی لە ئێران، لە دەوروبەری ساڵی ١٩٥٣دا، و مانەوەی حکومەتی کودەتا لە ئێراندا، کە بەرهەمەکانی عەلەوی لە سایەیدا قەدەغە کران، بووە باعیسی ئەوەی کە چاوەکانی و هەندێ لە چیرۆکە هەڵبژاردەکانی ئەو لە کن خوێنەرانی بەرهەمی ئەدەبی بێ کاریگەر بن و تەنیا نووسەران بە دوور لە چاوی کاربەدەستانی ئەمن روویان دەکردە ئەم بەرهەمانە.(ئەم رۆمانە ، چاوەکانی لە لایەن بڕای نووسەرو وەرگێڕ ئازاد بەرزنجییەوە کراوە بە کوردی‌وچەند جارێك چاپکراوەتەوە..ح.ع)

عەلەوی لە فەروەردینی ١٣٣٢ (١٩٥٣) بۆ چارەسەری نەخۆشی رۆیی بۆ ئەوروپا، بەڵام چونکە کودەتای ٢٨ مورداد بەرپا بوو، لە ئەوروپا (ئاڵمانیای رۆژهەڵات) مایەوە. چیرۆکەکانی ئەم قۆناغەی عەلەوی پتر دەربارەی زندانیانی سیاسی، پەناهەندە، داخ و کەسەری دەربەدەری‌و تاسەی قوڵی گەڕانەوە بۆ ئێرانە.

هەڵبەتە گێچی بەرهەمی ئەم قۆناغەی عەلەوی لە چاو چاوەکانی‌و هەندێ چیرۆکی ناو کۆ چیرۆکی نامەکان، لە هاتنە خوارەوەدایە، ساڵانی دوورو درێژی دووری لە ئێران، بووە مایەی ئەوەی کە عەلەوی نەك هەر رووداوە کۆمەڵایەتییەکان زۆر بە درەنگەوە دەرك بکات، بەڵکو پەیوەندیشی بە زمانی فارسییەوە زیاتر لە رێگەی نووسراوانەوە بێ، ئەمەش زۆر بە زەقی لەو چیرۆکانەدا کە لە دەربەدەری دا نووسیونی، رەنگی داوەتەوەو دیارە. وەکو کۆمەڵە چیرۆکی میرزاو دێو! دێو!، سالاریها و موریانە.

عەلەوی لە سەرەتای چالاکی ئەدەبی خۆیەوە، لە پاڵ نووسیندا، دەستی لە کاری پاچڤەشدا هەبووە، دەکرێ وەرگێڕانی: خائورلیان، نووسینی شیللەر و داستانی نەتەوەیی ئێران، نووسینی تێودور نۆلدکە بە نموونە بهێنرێنەوە هەروەها بەرهەمی کۆمەڵێك نووسەری ئێرانی بۆ ئەڵمانی وەرگێڕاوە، لەوانە بەرهەمەکانی سادقی هیدایەت، و حەوت پەیکەری نیزامی گەنجەوی، هەروەها کۆمەلێك چیرۆکی عەلەوی بەناونیشانی (دیواری سپی) کە پازدە چیرۆکە کراون بە ئەڵمانی و وەرگێڕەکان زۆر بە باشی دەرەقەتی هاتوون. هەروەها (چاوەکانی – ١٩٥٩)ش لەلایەن هربرت ملتزیگ–ەوە کراوە بە ئەڵمانی.

عەلەوی لە ساڵانی ئاوارەیی و دەربەدەری دا لە زانستگەی هومبولدت خەریکی دەرس گوتنەوە بووەو بەوە ژیانی خۆی بەڕێوە بردووە. جا کاری گوتنەوەی زمان و ئەدەبیاتی فارسی بە خوێندکارانی بێگانە، بەتایبەتی خوێندکارانی ئاڵمانی زمان کردیە کارێك کە روو بکاتە کاری لێکۆڵینەوەش و لەم بوارەدا دانانی فەرهەنگێکی فارسی– ئاڵمانی‌و مێژوو و پەرەسەندنی ئەدەبیاتی مۆدێرینی فارسی کە خەڵاتی کۆڕی زانیاری بەرلینی وەرگرت، شایانی باسن.

عەلەوی نووسەرو مرۆڤێکی راستگۆ بووە، هەم لە کاری نووسین و هەم لە ژیاندا کەسێکی وردو جدی بووە، لە ساڵی ١٩٥٩دا بەمجۆرە باسی خۆی کردووە: "باوەر بکەن ئەم بنیادەمەی کە لە بەردەم ئێوەدا دانیشتووە، واتە بزورگی عەلەوی، هیچ کاتێك قارەمان نەبووە، بەڵام هیچ

کاتێکیش ترسنۆك نەبووە.. ئەمەی کە دەبوایە بگەڕاماوەو خەباتم بکردایە، ئەمە شتێکی دیکەیە. من ئەوەندەی دەگەڕێمەوە سەر ژیانی خۆم و بە ژیانی خۆمدا دەچمەوە دەبینم هیچ کاتێك درێغیم نەکردووە...."

عەلەوی پیاوێکی نەرم و ناسك و ئارام بوو، بەڵام لە هەمان کاتدا سەخت و بە هەڵوێست بووەو هەرگیز ملی بۆ شتێك نەداوە کە باوەڕی پێی نەبوو بێ، عەلەوی وێنەو نموونەیەکی زندووی نووسین و چیرۆکەکانیەتی و شیلەیەکی خودی خۆی بووە بە ئامیان و خومرەی بەرهەمەکانی.

هەڵبەتە عەلەوی لە دوای شۆڕشی بەهمەنی ساڵی ١٣٥٧ (١٩٧٩) وەکو گەلێك لە ئاوارەو دەربەدەرەکان بۆ ئێران گەڕایەوەو چەند مانگێك مایەوەو دیسانەوە ڕێگەی غەریبایەتی گرتە بەرو بۆ ئەڵمانیا گەڕایەوە، عەلەوی پیاوێکی زۆر خاکی و بێ هەوا بوو، زۆر کەم باسی خۆی کردووە، تەنانەت لە چیرۆکەکانیشیدا جار جارێ وەکو گوتیار (ڕاوی) دەردەکەوێ و کەمتر باسی خۆی دەکات. عەلەوی خێزاندارەو تاقە کوڕێکی هەیە بە نێوی (مانی عەلەوی) کە ئەندازیاری تەکنیکی زانستگەی مونیخە... عەلەوی لە رووی رۆشنبیرییەوە دیاردەیەکە لە نێوان دکتۆر ئەرانی و سادقی هیدایەتدا کە کاریگەری هەر یەکێکیانی بە شێوەیەك پێوە دیارە.

بە هەر حاڵ عەلەوی لە ریزی پێشەوەی کاروانی ئەدەبیاتی تازەی ئێرانەوەیەو لە واری چیرۆکڤانی تازەی ئێراندا خزمەتێکی شایستەی کردووەو بمانەوێ و نەمانەوێ جێ دەستی دیارە.

بە هەر حاڵ بە دەگمەن لە جیهانی دێرینەی کەلتوورو شارستانیەتی ئێراندا کەسێك دەبینرێ ئەوەندە بە درێژا لە دووری مەفتەن و زاگەو زێدی خۆی مابێتەوە.. عەلەوی لە ساڵی ١٩٧٤ەوە وەکو مامۆستای زانستگەی هومبولتی بەرلین مامۆستای سەرپەرشتیارو ڕێنوێنی قۆناغی دکتۆرای زمان و ئەدەبیاتی فارسی خانەشین کرا، و لە زستانی ساڵی ١٣٧٥ (١٩٩٦) لە بەرلین کۆچی دوایی کرد. بە هەر حاڵ با بێینەوە سەر بابەتەکەی خۆمان کە کۆچیرۆکی (چمدان- جانتا)یە.

چەمەدان یەکەمین کۆچیرۆکی عەلەوییە، لە ساڵی ١٩٣٤دا چاپ و بڵاو بووەتەوە. عەلەوی پێش ئەوە کورتە چیرۆکی مێژوویی (دێو)ی نووسیوە، کە دەربارەی هێرشی عەرەبە بۆ سەر ئێران، ئەم چیرۆکە لە کۆ چیرۆکی (ئەنیران)دا کە بریتییە لە سێ چیرۆك، (دێو) هی عەلەویەو دووانەکەی تری هی هیدایەت و ش- پرتەوە، لە ساڵی ١٩٣١دا چاپ و بڵاوبووەتەوە.

ئەم کۆمەڵە چیرۆکە شەش دانە چیرۆکی لە خۆ گرتووە، چیرۆکی (شیك پۆش)ی لێ بترازێ کە تەنز ئامێز و کۆمەڵایەتی- رەخنەییە، ئیدی ئەوانی دی هەر هەموو مۆرکێکی سێکسی و خەمینییەکی رۆمانسیانەیان پێوەیە. کاریگەری دۆستۆفسکی، زوایك، دەروونناسی فرۆیدیو رۆمانتیك و ئێکسپرسیونیستەکانی ئەڵمانیایان بە زەقی پێوە دیارە. هەندێکیان لە رووی تیمەو تۆن و شێوازەوە لە کورتە چیرۆکەکانی هیدایەت دەچن. ژینگەی چیرۆکەکانی ترسناك و خەمینە، لە دوانیاندا (کورتە مێژوویەکی ژوورەکەم، بووکی هەزار زاوا) ئاهەنگی مۆزیقا بووە،

بـه بەشـێك لـە بونیـادو تـەكنیكی چیرۆكڤانی. عەلـەویش مینـاكی هیدایـەت دڵبەنـدو شـیفتەی مۆزیقاو موزیقای رۆژاواییـە، لـە (سـەمای مـەرگ) و (بـووكی هـەزار زاوا)و... هتـد مۆزیقـا وەكـو فاكتەری پێشڤەبرنی پلۆت و گرێچنی چیرۆك بەكار دەبات. مۆزیقا چ لـەلای عەلـەوی و چ لـەلای هیدایەت، زیـاتر دەربـڕی حاڵـەتی غوربـەت و دووره ولآتـیو خـەمباری و داخ و حەسـرەتە.. جا وە نـەبێ ئەمانـە شـارەزای مۆسـیقا بـووبن، بـە تایبـەتی عەلـەوی بـەخۆی دەڵێـت كـە بابایـەكی مۆزیقا ناس نییە، بە تایبەتی مۆزیقای ئێرانی، بەڵكو حەزی لێیەتیو دەبێ بـەدەم نووسـینەوە گـوێ لـە مۆسـیقا بگرێـت.. باسـی ئـەوە دەكـات كـە دۆسـتایەتی ئـەو و هیدایـەت لـە مۆزیقـاوە دەستی پێكردووە، هیدایەت گرامافۆنێكی هەبووە، كە یەكیان گرتووە بەكرەیەكیان خستووەتە سەری و بە سەعاتان گوێیان لێگرتووە... هیدایەت كە زۆر خەمبار دەبوو پەنای وەبەر مۆسـیقا دەبرد بـە تایبـەتی گـوێی لـە سـەمفۆنیای شەشـەمی چایكۆفسـكی رادەدێـرا.. بۆیـە لـە چیرۆكی (كورتـە مێژوویـەكی ژوورەكـەم)دا ئـەم رسـتانە دەخوێنینـەوە: "بـە كۆمـەڵ گۆرانیمـان چـڕی، گرامافۆنمـان لێـدا، تەنانـەت مسـتەر شـولتس كـەمێ مەسـت بـوو". یـان نـەرگز لـە چیرۆكی دەربــەدەردا مــەفتونی مۆزیقایــە: "دەرەقســی، گــۆرانی دەچــڕی، قاقــا پێدەكــەنیو باشــتر دەغەزری". لە (چاوەكانی)دا فەرەنگێز و دونـاتللو دەچنە بەلـەم سـواریو لـەوێ دونـاتللو بـەرە بەرە دەستی بە سۆزە كرد، دەنگێكی گڕی هەبوو. بە بازووە توندو تۆڵەكانی ئاوەكەی دادڕی و دەنگـی لـێ هەڵـدەبڕی. گۆرانیـەكی پـڕ جۆشـی سـەیر بـوو". لـە چیرۆكی (بـووكی هـەزار زاوا)دا كاریگەریی مۆزیقا زیاترە،و ئاوێتەی تانو پۆی چیرۆكەكە بووە، كابرایـەكی ویڵـۆن ژەن كـە لـە ژیاندا شكستی هێناوە لە باڕێكدا دادەمەزرێ تا پارەی گوزەران و بژێوی خـۆی دەربێنـێ، ئـەم كابرایـە لـە هەرزەكاریـەوە رمـوودەی مۆزیقـا بـووەو پاشـان بـۆ فێـر بـوونی مۆزیقـا دەچـێ بـۆ هەنـدەران، پاشـان دەگـەڵ كیـژێكی دراوسـێی خۆیانـدا بـە نێـوی (سۆسـەن)، كـە دەنگـی خـۆش بـووەو بـاش سترانی چڕیوە زەماوەنـد دەكـات. زۆری پـێ ناچـێ نـاكۆكی و ناسـازیان ئاشـكرا دەبـێ، كـابرای سـازڤان شـیفتەی دەنـگ و ئـاوازی سۆسـەن بـوو، بـە تایبـەتی ئـەو گـۆرانی و ئاوازەی كـە بـە منـداڵی لـە سۆسـەنی ژنـەوتبوو، بـەڵام ئێسـتا سۆسـەن نەیـدەتوانی بـەو ئاوایـە ستران بچڕێت، "سۆسەنیش ئەوی خۆش نەدەویست.. سۆسەن ڤیان و ئەشقی دەویسـت بـەڵام كابرای سازڤان گۆرانی و ئاوازی دەویست".

سۆسـەن پەیوەنـدی دەگـەڵ خـەڵكانی دیـدا دەگرێـت، "بـەڵام سازڤانەكە نەیدەویسـت لـە خـۆیی بتۆرێنێ، لەوەیە جارێكی دی ئەو ئاوازو ئاهەنگە ون بـووە بدۆزێتـەوە، ئـەو حـەزی لـە دەنـگ و ئاوازی سۆسەن بوو، لە شی بۆ هەر لەشخوازێك".

لـێ كـابرای سـازڤان كـە ئـەو ئاهەنگـە گومبـووە نادۆزێتـەوە، ئیـدی سۆسـەن بـەرەڵڵا دەكـات، دەستی چارەنووس سۆسەن (كە ئێسـتا سوسكێی باڕێكـە)و ئـەو دوای سـاڵانێكی دوورو درێـژ رووبەڕووی یەكتر دەكاتەوە. سۆسەن جوانترین ژنی باڕەكەیە، پیاوانی مەست و نیمچە مەسـت دەورو خونی دەدەن. كابرای سازڤان غەرقی خاوبوونەوەو مەستی و هەراو هەنگامـەی مەسـتان

و خنەخنی ژنان بووەو کەوتووەتە قوڵایی یادگارانەوە... ئاهەنگە ونبووەکەی دەدۆزێتەوەو لێی دەدا.
تەلاری بارەکە کە نقومی شادی و هەراو هەنگامە بووە، بە گلەییەوە لە باوەشی کپی و بێدەنگی دا مت بووە، ئەمە چ ئاهەنگێکە؟ بارمەنەکە، سازڤانەکە ئاگادار دەکاتەوە، لیٚ ئەو لەم جیهانە نییە، لە دنیای خەونانی خۆیدایە، حەشاماتەکە بەرەو ئەو هێرش دەبات بەڵام لە ناکاو سوسکیٚ دەڵێت: سەبرکەن... و هەموویان بێدەنگ دەکات... کابرای سازڤان چاوانی دەکاتەوەو سۆسەن لە قیافەتی سوسکێدا دەناسێتەوە: "ئەمە هەمان ئەو ژنەیە کە لە گوێی ئەستێلەکەدا ئەو ئاوازانەی چڕی و ئەوی تێگەیاند کە ... بە ئەسپایی بەرەو لای ئەو چوو، سۆسەن دەترساو پاشەوپاش دەکشایەوە. هەنگیٚ کەوانەکەی بە تەلەکەدا هێنا، ئاوازەکەی دوا شەوی وەبیر هاتەوە، ئەم ئاوازە روح و گیانی زەمانی لاویی ئەو بوو.. سۆسەن دەلەرزی... حەشاماتەکە ئەبڵەق و واق ورماو تەمەشای ئەم دووەیان دەکرد، گەمەیەکی جوانیان دەکرد.. گریەی وێڵونەکە توندتر دەبوو.. داخی بۆ ئەوە دەخوارد کە بۆچی تەمەنی بە فیڕۆ چووە، دەیویست تۆڵە لەو هۆکارو سەبەبکارانە بستێنیٚ کە رۆژی ئەویان گەیاندووە بەم رۆژو رۆژگارە. ئەوسا سۆسەن چڕی. گۆرانی چڕی. هەمان ئەو شیعرەی چڕی کە لە شەوی یەکەمدا چڕی بووی (بە تەمای دروستی عەهدو وەفا مەبە لەم جیهانە بیٚ بەقایە، چونکە ئەم پیرە دنیایە بووکی هەزار زاوایە) ئەوانەی کە مەست بوون، بەدمەست بوون. سۆسەن لە پڕ راپەڕی، سازەکەی لە دەست سازڤانەکە سەندو کێشای بە عاردی دا. ترق!! تەلەکانی پچڕان.. هەموو ترسان، ژنەکان پاڵتۆکانیان لەبەر کرد، سوسکیٚ-ش لە ژوورەکە وەدەر کەوت،" هەموو دەڕۆن و سازڤانە مەستەکە بە وێڵۆنە شکاوەکەی و دڵ و گیانی شکاوەوە بە تەنیٚ دەمێنێتەوە.
چیرۆکی (جانتا) کێشمەکێشمی دوو نەوە، باب و کوڕ دەنوێنیٚ، بابەکە پیاوێکی بەزاکون، دەوڵەمەند و سەلارو سەنگینەو کوڕەکە کەسێکی ئەشقبازو بیٚ موبالات و خەمساردە. دیارە کە ئەو جووتە دانویان لەیەك مەنجەڵ ناکولیٚ. کوڕە بابی بە جێدێلیٚ "چونکە حەز ناکات، هەموو رۆژیٚ سەعات یەکی دوای نیوەڕۆ فراڤین بخوات، و هەموو شەویٚ سەعات یازدە لە ماڵەوە بیٚ و بخەویٚ و بەیانی سەعات حەوت لەسەر خوانی تاشت ئامادەبیٚ".
بابەکە بۆ وەی کوڕەکەی ئاشت بکاتەوە، رووی خۆی دەنێتە ژێر پیٚ و دیٚ بۆ ژووری کوڕەکەی، بۆنی ئەو عەترەی کە لە ردێنی تازە تاشراوی بابەکە دێت، لای کوڕەکە ناخۆشە. رێك و پێکی و زاکونی بابەکە، ئەو ویقارو خانەدانیەی کە بابەلباب بۆ بابەکە ماوەتەوە، لەگەڵ ژیانی پەرێشانی کوڕەکەدا ناسازیٚ و تێك ناکاتەوە، کوڕە دەگەڵ ژنێکی رووسی جواندا بە نێوی (کاتوشکا) دۆستایەتی پەیدا دەکات، لەگەڵیا رادەبوێریٚ و کەیف دەکات: "من لەزەتم لە سینەی سپی.. وەردەگرت.. لەزەتم لە گەردنی کێلی دەبینی، دەمروانیە مژۆڵە رەشەکانی کە هەموو چاویان داپۆشی بوو، گوێم لە قسەکانی نەدەگرت چونکە قسەی زۆر ئاسایی بوو".
بابەکە دەیەویٚ سەفەری (سیتو) کە هاوینگەیەکی سەر سنووری چیکۆسلوفاکیا بوو بکات. کوڕەکەشی دەعوەت دەکات کە بۆ ئەوێندەر بچیٚ، کاتوشکاش دەخوازیٚ بۆ ئەویٚ بڕوات و شوو

بكات. ژنه روسەكه له هەنبەر نارەزایی كوڕەكەدا دەڵێت: "خۆ من دەبێ بژیم، دەبێ شوو بكەم، بەڵام دێوێكی شوومی شڕی كۆنی ترسناك، پارە، ژینگە ئەوی ناچار دەكرد كە بچێ خۆی بفرۆشێت". كوڕە هەوەڵجار نایەوێ بۆ (سیتۆ) بڕوات، بەڵام چونكە دەبوایە جانتاكەی بابی لە وەختدا بگەیەنێتە وێستگەی قیتار ناچار دەبێ بۆ ئەوێ بڕوات. هەر كە دەچێتە تەلارەكەوە دەبینێ كاتۆشكا لەلای بابی دانیشتووە. بابی ردێنی ساف و لوس تاشیوە، ژنە روسەكەش جلێكی شینباوی لەبەر كردووە و لە هەموو كاتێ جوانتر بووە، كوڕە پارچە كاغەزێك دەنووسێت و دەیداتە پێشخزمەتەكە تا بیدات بە ژنەكەو ئەوجا ئەوێ بەجێ دێڵێ، لە كاغەزەكەدا نووسراوە كەتۆ دەتویست بابم بە تۆ بناسێنم، هەمان ئەو كەسەیە كە لەگەڵ تۆدا دانیشتووە. دەربارەی شووە تازەكەت كە رای منت پرسی بوو، مێردێكی فرە خاسە، بەختەوەرت دەكات.

چیرۆكی (چەمدان- جانتا) پلۆت و نەخشەیەكی مكوم و بتەوی هەیە، لە ریزی چیرۆكە باشەكانی عەلەوی دایەو شان لە شانی چیرۆكی (گێلە پیاو، میرزا، رسوایی) دەدات، ئەم چیرۆكەش وەكو زۆربەی چیرۆكەكانی دیكەی عەلەوی لە كرۆكو بابەتدا خەمناكە. راستە لەم چیرۆكەدا كێشماكێشمی دوو نەوەی ژینگەی سەرمایەداری نیشان دەدرێ، بەڵام بەبای قولی (باوكان و كوڕان)ی تورگنیفدا ناگات. وێڕای ئەمەش (چەمەدان) و (سەربازی قورقوشمین)و (كورتە مێژوویەكی ژوورەكەم) لە چیرۆكە هەرە باشەكانی عەلەوین.

لە چیرۆكی (كورتە مێژوویەكی ژوورەكەم)دا دیسان لاوێكی سەرگەردانو بێزار لە خێزان و كەسوكار، دەڕواتو لەماڵێكدا ژوورێك بەكرێ دەگرێتو لەوێدا بە سەربوری خەمینی (مەدام هاكوپیان)و كوڕەكانی بە شولتس و ژنەكەی ئاشنا دەبێت. لە ماڵی مەدامدا ژوورێك هەیە هی كوڕە گەورەكەیەتی (ئارشاویر) كە ماوەیەك لەوەبەر مردووە. مەدام ئەم ژوورە بەكرێ نادات. نەگبەتی (مەدام) لەو كاتەوە دەست پێدەكات كە شولتسو (موهاجیرێكی ئەڵمانیەو ماوەیەك لە كاتی یەكەم جەنگی جیهانی دا لای روسەكان یەخسیر بووە) ژنە جوانەكەی (كاچا) دێنە ماڵی، شولتس نیمچە كوێرە، بەڵام پزیشكان لەو باوەڕەدان كە كوێریەكەی ئەنجامی شۆكێكی عەسەبیەو قابیلی چاك بوونەوەیە. مەدام و كوڕەكانی _ئارشاویرو ئاداشس، شولتسو هاوسەرەكەی شەوان لە دەوری یەكدی خڕ دەبنەوەو گوێ لە مۆزیقا رادەدێرن. لێ كەش و هەواو هاماجی خانە گومانی باڵی بەسەر ماڵەكەدا كێشاوەو ئایندە بە رووداوانی ناخۆش و تاڵ ئاوسە. چونكە شولتس بە زۆری لە ماڵەوە دەمێنێتەوە، كاچاو ئارشاویر دەچنە رەقس و گەڕان و ئاشنایەتیان بەرە بەرە دەبێ بە ئەشق و ڤیانێكی ئاگرین. (ئارداشس)ش نیگەرانی رووداوەكانەو چووەتە قاوغی خۆی و خۆی لەوانی دی دوورە پەرێز دەگرێ. (شولتس)ش نیگەران و تورەیە، و كاتێ كە مەدام چیرۆكی (ژنانی زانا)ی شنیتسلری بۆ دەخوێنێتەوە، تورە تر دەبێ، چونكە لەم چیرۆكەدا باس لەوە كراوە كە زانایەك ژنەكەی خۆی لە باوەشی یەكێك لە قوتابیەكانی خۆیدا دەبینێ، بەڵام نهێنی خیانەتی هاوسەرەكەی بە كەس ناڵێت. قوتابیەكە كە مامۆستاكەی دەبینێ، هەڵدێ، بەڵام ژنەكە كە پشتی لە دەرگاكە دەبێ، نازانێ كە مێردەكەی

بینیویەتی. شولتس دەڵێت: "نە، ئەمە مەحاڵە.. چتۆ دەبێت پیاوێك حەوت ساڵی رەبەق هەرزەیی و بێ ئابڕوویی ژنەکەی بدینێ و خۆی لە گێلی بدات".

چەند رۆژەك دەبورێ، شەوێ کە لە ماڵەوە ئاهەنگێکیان بەرپا کردگەو هەموو هەر تورەو نیگەرانن، کاچا لەسەر پێشنیازی مێردەکەی بۆ سەما لە بارێك دا دەگەڵ ئارشاویردا لە ماڵ وەدەردەکەون. لێ بە دزییەوە بۆ ژوورەکەی ئارشاوێر دەگەڕێنەوە،و ئامبێزی یەکتر دەبن. ئارداشس، لە رق و حەسودی دا، هاتنەوەیان بە ماڵەوە رادەگەیەنێ، شولتس دەمانچەکەی هەڵدەگرێ و بۆ ژوورەکەی ئارشاویر دەڕوات، کوڕە لاوەکەی مەدام و ژنەکەی خۆی دەکوژێت.

چیرۆکی (قوربانی) کە یەجگار لە کورتە چیرۆکەکانی هیدایەت دەچێت، بریتییە لە بەسەرهاتی خوسرەو، ئەمە لاوێکی دەوڵەمەندە، ناسکە، خوێنەوارەو دووچاری سیل و دەردە باریکە بووەو دەبێ لە هەرەتی لاویدا بمرێ، بەڵام زۆر شەیداو دڵبەندو ئارەزوومەندی ژیانە، دەزگیرانێکی هەیە بە نێوی (فروغ) کە زۆری خۆش گەرەکە، لاوەی سیلاوی لەگەڵ بیری مەرگ دا لە زۆراندایە، بۆ دەبێ بمرێ؟ گوڵان کە لەپایزدا دەوەرن، لە بەهارا دەڕوێنەوە، لێ مرۆڤ کە مرد ئیدی نا گەڕێتەوە، بیرکردنەوە لە مەرگ، خەسرەو بەرەو نەخشەیەکی سەیر بکێش دەکات و بە هەڤاڵەکەی دەڵێ: "فروغ تا نهو هەزار چەلی بە من گوتووە خودایە مەرگم پێش مەرگت بکەوێ.. رۆژی جەژنی قوربان لە جیاتی مەڕ، فروغ دەکەینە قوربانی". ئیدی لە دوای ئەم قسەیەوە لەگەڵ فروغ دا زەماوەند دەکات، و بۆ مانگی هەنگوین دەچنە خانوویەکی کەنار دەریاو لەوێ خۆی دەخاتە ئاوەوەو دەخنکێ. فروغیش تووشی سیل دەبێ و دوای ساڵێك دەمرێت. لۆژێکی خەسرەو لەم کارە سەیرەدا ئەمەیە:

"تۆ ئاگات لێیە کە چۆن دەسووتێم. دەبێ بەلاوی بمرم. ئاخر بۆچی؟ هەر لەبەر ئەوەی لە خەڵکی تر باشترم... زیاتر شت دەبینم و حاڵی دەبم؟ بە لەزەت و کەیفی خەڵکان، قەڵس دەبم... جگە لەمەش بە چ مەعلوم من دەمرم؟ بەڵکو باشتر بووم. لەوەیە زەماوەند حاڵم باشتر بکات.. .بە چ مەعلوم فروغ لەگەڵ مندا بەدبەخت دەبێ، تەقو بەختەوەر بوو"..

هەڵبەتە بەپێی رەوتی گەشەسەندنی رووداوی چیرۆکەکە، خۆ کوژیەکەی خوسرەو ئاسایی و لۆژیکیە، بەڵام مەسەلەی تووش بوونی فروغ بە سیل و پاشان مردنەکەی ئەمەیان زیاتر رووداوێکی دەستکردەو نووسەر بۆ زیاد کردنی کاریگەریی چیرۆکەکە، لە دەرێ را بەسەر تێکڕای چیرۆکەکەیدا سەپاندووە، و لەمەش نا ئاسایی ترو دەستکردتر رستەی کۆتایی چیرۆکەکەیە!" فروغیش بە نەخۆشی سیل مرد، ئەو بوو بە قوربانی هەمووان". کەس نازانێ چۆن گەنجێکی نەخۆش، تورە و نیگەران و ئامبازی بیرو ئەندێشەی مەرگ بووە بە قوربانی هەمووان؟ هەموو ئیمتیازێکی خوسرەو لە ناسکی و زانست و بەهرەو سەلیقەکەیدایە، بەڵام نەخۆشی مەودای نادات کە خزمەتێکی شایستەی وڵاتەکەی بکات یان لە بزاڤێکی کۆمەڵایەتی دا بەشداری بکات. زۆر کەسی وەکو ئەو لە دنیادا هەن کە بە هۆی تامپۆن یان نەخۆشییەوە جوانە مەرگ دەبن، بەڵام ناکرێ، ئەو مەرگەیان بە قوربانی لە پێناوی خەڵکی دا لێك بدرێتەوە.

لە خوسرەو نەگبەت تر (ئاغای ف)ی قارەمانی چیرۆکی (سەربازی قورقوشیمنە). ئەمیان فەرمانبەرێکی دەرکراوی دایەرەی قەلاَچۆی تلیاکە. زندووە بەلاَم هەزار خۆزگەی بە مەرگ خوسرەو دەمریَو بۆ خۆی دەحەسێتەوە بەلاَم (ئاغای ف) دەژی و ئازارو عەزاب دەچێژێ. (ف) لە سەفەرێکیا بۆ بوشەهر ئاشنایەتی دەگەلاَ ژنێکدا بە نێوی (کەوکەب) پەیدا دەکات، و دەیبات بۆ ماڵەکەی خۆی و ئیدی بەدبەختی ئەو لەو رۆژەوە دەست پێدەکا. جا بەسەر هاتی ئەم قارەمانە لەسێ زمانەوە دەگێڕدرێتەوە:

لە زمانی خۆیو خا ئامینی خوشکی و کەوکەبەوە. کورتەی بەسەر هاتو واریقاتەکەشی ئەمەیە کە پاش ناسینی کەوکەب لە بوشەهر دەمێنێتەوەو گوێ بە نامەکانی دایەرە ناداتو لە کار دەردەکرێ، ناچار بۆ بەڕێوەبرنی ژیانو گوزەران دەگەڵ کەوکەب دا سەربازی قورقوشمین دروست دەکاتو دەفرۆشێت. پاشان کەوکەب پێوار دەبێ و دیار نامێنێ، ئاغای ف شێت ئاسا بۆ تاران دێتو جارەکی دی کەوکەب دەدۆزێتەوە، بەلاَم کەوکەب هەمدیس لە دەستی هەڵدێ. تا سەرەنجام لە دوا دیداری دەگەڵ کەوکەب دا، دەیکوژێت. خۆی دەربارەی کەوکەب دەڵێت:

"هەر کە ئەم ژنە هاتە ژیانی منەوە، وەزع و حاڵی شێواندم.. من کەوکەبم خۆش دەویست.، خۆشم دەویست، وەکو چۆن بنیادەم دایکی خۆش گەرەکە، بەلاَم هیچ پەیوەندییەکمان لە بەینا نەبوو.. درەنگە شەوانێ بۆ ماڵ هاتمەوە. سەیرم کرد کەوکەب لەسەر بوخچەکەی دانیشتووەو خەریکە شڕو شیتاڵەکانی دەگەڕێ. لێم پرسی: چی چیت گوم کردگە؟ تەماشام کرد، هەنسکە هەنسك دەگری: لەیستۆکێك.. سەربازێکی قورقوشمین! سەیرم لێهالتو گوتم: جا سەربازێکی قورقوشمین بایی دەشاهیە. ئەم هەموو گریان و زاریەی ناوێ. وەك بڵێی لە قسەکەم نەگەیی، پێی گوتم: دە شاهیان بۆ من بە ئەندازەی گیانم بەهای هەبوو... گوم بوونی سەربازەکەی بە نیشانەی بە دومی دەزانی..."

ف و کەوکەب یەك ساڵ پێکەوە دەژین. (ئاغای ف) سەربازی قورقوشمین دروست دەکاتو دەیفرۆشێتو جارێك دانەیەکیان دەخاتە بوخچەکەی کەوکەبەوە، بۆ خۆیشی شەوانە خەونی ترسناك دەبینێ: "خەوم دەبینی ئەفسەرێك بە شمشێری رووتەوە هێرشی دەبردە سەر دایکم، بابم لەوێ وەستا بوو و فزەی نەدەکرد."

خائامین دەڵێت: "بابم هیچ کاتێ ئەم منداڵەی خۆش نەدەویست. دایکم بە پێچەوانەوە. ئامادە بوو ئێمە هەر پێنجمان لە گۆڕ بنێ، بەلاَم تاڵە موویەك لەسەری ئەم منالە نەکەوێ. بۆ یەکتر دەمردن، دایکم پێی دەگوت: تۆ یوسفی منی.. راستت دەوێ، ئەم منداڵە لە سوێی دایکم وای لێهات.. چوونەکەشی بۆ بوشەهر لەسەر ئەمە بوو کە باوکم ژنی هێنایەوە.. ئەم دەیووت تۆ لە جیاتی ئەوەی ئەم هەموو سیغەیە بێنی، تۆزێکت لە دایکما خەرج کردبا نەدەمرد. بەلاَم بابم چ بڵێ باشە.. زمانم لاڵ.. دەیگوت تۆ دەست درێژیت کردووەتە سەر ژنەکەی من.. ئێستاش ئاوایە، شەوانە لە ناکاو هەڵدەستێ هەر شتێك وەکو بوخچە بێ، دەیکاتەوە".

کەوکەبیش دەڵێت: "تۆ ئەگەر منت بوێ، من ئیدی ناچمەوە لای ئەم بۆرە پیاوە قورمساغە... من گیانم بەسەر ئەوەوە دەردەچوو، گیانم لە رای ئەودا دادەنا، من لە بوشەهر ئەوم ناسی.

شەوێك پێی گوتم: کەوکەب من تۆم فرە خۆش گەرەکە. تۆ وەکو دایکمی... گوتم من حازرم ببمە سیغەی تۆ... گوتی نە تۆ دایکی منی. خۆ بنیادەم ناتوانێ دایکی بخوازێ... چیت عەرز بکەم، چۆنتان پێ بڵێم... ئەسڵەن پیاو نەبوو. وەکو شێتان خۆی بەسەرما دەدا. سەروچاوی ماچ دەکردم. هەر کە من دەستم بۆ دەبرد، لێی دەدام. جنێوی دەدامێ، گیسوەکانی دەسکەنە دەکردم. رۆژێك هەندەی دارکاری کردم بورامەوە. ئیدی لە دەستی هەڵاتم".

چیرۆکی (سەربازی قورقوشم) بە دیدو بۆچوونێکی فرۆیدیانەوە نووسراوە. عەلەوی لەم چیرۆکەدا، جۆرە لێکچوونێك لەگەڵ هیدایەتدا پەیدا دەکات. بۆ نموونە کەوکەب بە گوم بوونی سەربازە قورقوشمینە کە خەمبارەو بە نیشانەی بەدومی دەزانێت. (ئودیت)ی قارەمانی چیرۆکی (ئاوێنەی شکاو)ی هیدایەتیش ئاوێنە شکاوەکەی پیشانی کابرای دڵخوازی خۆی نیشان دەدات و دەڵێت: (ئەو شەوە کە جانتاکەت لە پەنجەرەکەوە توڕدام، وای لێهات. دەزانی ئەمە نەگبەتی دێنێ). بێ توانایی سێکسی (ف) دیمەنێکی چیرۆکی (تەجەلی) وە بیردێنێتەوە. ژنە لەشفرۆشەکەی ئەم چیرۆکە بە سازڤانە پیرەکە دەڵێت: "هەیدێ گوم بە لە بەرچاوم! شەرم ناکەی؟ خاکت بەسەر! تۆ کە پیاو نیت... مرۆڤ بچێتە نك سەگ باشترە".

ئاغای (ف) لە (چمدان)دا لە روویەکەوە لە گوتیاری (راوی) (بوف کور)ی هیدایەت دەچێت. لە (بوف کور)شدا، کابرا ناتوانێ پەیوەندی سێکسی بەرقەرار بکات، ئەویش لە بابی بێزارەو وەکو پیرەمێرێکی زورهانی کە لەلای دەبینێ، لە نوێنی خاڵی ژنەکەیدا هەر تل دەدات، بەترسەوە دەبینێ ژنەکەی گەورەو ئاقڵ بووە، بەڵام خۆی هەر لە حاڵی منداڵی دا ماوەتەوە. دەکەوێ بەسەر پێی ژنەکەیدا، ماسولکەکانی پێی تامی قونە خەیار دەدات: "ماسولکەکانی پای...م کە تاڵێکی خۆش و تورت بوو لە ئامێز گرت، ئەوەندە گریام، گریام. نازانم چەند سەعاتی بەسەرا رۆیی. هەر کە وەئاگا هاتمەوە سەیرم کرد ئەو رۆییوە"، و پەنا وەبەر تلیاك و شەراب دەبات: "کاتێ کە تلیاکم دەکێشان بیرم گەورە، ناسك، ئەفسون ئامێزو سەر رێژ دەبوو. لە ژینگەیەکی تری ئەو دیوی دنیای ئاساییدا دەکەوتمە گەشت و گەڕان".

لەم بارەیەوە گوتویانە کە "ئەو پیاوەی کە ناتوانێ لە قۆزاخەی منداڵی بێتە دەرێ‌و، پەیوەندی ئاشقانە دەگەڵ دایکی خۆیدا ببڕێ، بۆ هەڵاتن لە واقیع و بەنج کردنی ئەعسابی خۆی پەنا بۆ تلیاك و ڤەخوارن دەبات". کە ئەمە پڕ بە پێستی حاڵی (ئاغای ف)یە:

".... پاشان بووم بە تلیاکی، ئەو کاتانە دایکم تازە مردبوو.. ئەویش منی خۆش دەویست من شازدە ساڵان بووم، بەڵام تا دایکم دەستی دەنێو دەستم نەخستبایە خەو نەدەچووە چاوم، ئەمانە شتەلێك نین کە هەموو کەس بتوانێ لێی حاڵی بێ...".

خۆ ئەگەر لە روانگەی فرۆیدەوە تەمەشا بکەین، کاتێ کە (ئاغای ف) بێزاری لە بابی دەردەبڕێ یان ئەفسەرێك لە خەوا دەبینێ کە پەلاماری دایکی دەدات، دەبێ بڵێین:" پیاو لە ژن دەترسێت.. ژن منداڵ دێنێ و منداڵی نێرینە دەبێ بە خەنیم و رەقیبی سەر سەختی باب و دەگەڵیا بە شەڕ دێت. جگە لەمانە بەدەگمەن ژنێك هەیە بتوانێ بە تەواوەتی هاوتای ئەو بیرەوەرییە بکاتەوە کە پیاوەکەی دەربارەی دایکی خۆی هەیەتی و جێی چۆڵی دایك لە دڵی

مێردەکەیدا پڕ بکاتەوە. جا لەبەر ئەمە کەم ژن هەیە کە دەرەقەتی رازی کردنی مێردەکەی خۆی بێت و لە دڵا مایەی سکاڵاو بێزاری ئەو نەبێت".

لە چیرۆکی (شیکپۆش)دا عەلەوی دەمانباتە کەشو هەوایەکی تر. (نوا پور)ی ئەم چیرۆکە نموونەی رۆشنبیری هزر پەروەرو مێمڵ و مشەخۆرو بێکارەیە. ئەوەی بەلای ئەم پیاوە گرنگە شیکپۆشی و نووسینی داخراوی ئاڵۆزو رووتەڵ و بێ کاریگەرییە. بەلایەوە گرینگ نییە کە لە وڵاتا چ روو دەدا یا حوکمرانان چ دەکەن و کێ تاڵان دەکات و کێ تاڵان دەکرێ؟ ئەوەی بەلای ئەوەوە گرینگە پاك و تەمیزی و تاشینی رۆژانەی ردێن و لەبەر کردنی جلکی جوانە. بەلای ئەوەوە سەروسیمای جوان گرنگە نەك رەفتارو ئەتواری جوان. نواپور، کە بە خۆی نووسەرێکی بێ کتێبە، ریفۆرمی ئاکاری کۆمەڵایەتی بە ئەرکی نووسەر دەزانێ، دەخوازێ "شارستانیەتە هەوەڵینەکان"ی گوستافلوبون بکات بە فارسی، و دەڵێت جلك و بەرگ کاریگەرییەکی زۆری بەسەر سایکولۆژیای مرۆڤەوە هەیە، کابرایەکی قۆشمە پێی دەڵێت: خۆزیا ئەم شتانەت دەنووسی تا خەڵکی سوودی لێ وەربگرن، و نواپور گوتارێك دەنووسێت و لە رۆژنامەیەکدا بلاوی دەکاتەوە، ناوبانگی وتارەکە بە جۆرێکە کە هەمووان، بێ ئەوەی وتارەکەیان خوێندبێتەوە، ستایشی دەکەن. بەڵام یارۆیەك بێ ئەوەی بیەوێ، رۆژێك سەر لە سڕی ئەم کارە دەردێنێ. کابرا چووە قوماش بکڕێ، کوتاڵفرۆش، قوماشەکەی بۆ لە هەمان رۆژنامەدا دەپێچێتەوە کە وتارەکەی (نواپور)ی بلاوکردووەتەوەو ستایشی قوماشەکانی موغازەکەی ئەوی کردووە: "بەڵام لە ژێر وتارەکەدا ریکلامێکی خاوەنی هەمان موغازەم کە بە سەری حەزرەتی موسا سوێندی خواردبوو و قوماشەکەی بە کەمتر لە نرخی مایەکاری بە من فرۆشتبوو! بینی".

ئاغای (نواپور)ی عەلەوی لە (عەلامە)ی چیرۆکی (نیشتمانپەرست)ی هیدایەت دەچێت ئەویش بە وەرگرتنی پارەیەکی مۆڵ دەیەوێ کتێبێك دەربارەی "جەرجیس پێغەمبەرو ئامۆژگارییەکانی لە جیهانی بەشەریەتدا" بنووسێت و سەرمایەی زانستی ئەو ئەزبەر بوونی کۆمەڵێك شیعرو وشەیە.. هەڵبەتە تەنزی چیرۆکەکەی عەلەوی بە بای قولی ئەوەی هیدایەتدا ناگات، و پتر شەقڵ و مۆرکی قەشمەرجاڕی و پێکەنینۆکی پێوەیە.

کۆ چیرۆکی چەمەدان (جانتا) هەر چەندە لە بەرهەمەکانی سەرەتای عەلەوییە، نێوەرۆك و بونیادێکی سفتی هەیە، چیرۆکی (چەمەدان- جانتا، کورتە مێژووی ژوورەکەم و سەربازی قورقوشمین...) کە هەرسێکیان هەوێنی سێکسیان تێدایەو شێوازو دەربڕینێکی سایکۆلۆژیان هەیە، لەچیرۆکە هەرە باشەکانی عەلەوین.. هەڵبەتە عەلەوی کە بە تەبیعەت کەسێکی خاکی و بێ هەوا بوو، دەربارەی ئەم کۆ چیرۆکە گوتوویەتی: "من کاڵ و کرچی لەم چیرۆکانەدا دەبینم.. ئەگەر عادەتم وا بایە کە دەسکاری کارەکانم بکەم، زۆریانم دەگۆڕێ. هەندێکیان لە رادەبەدەر سۆزاوین... جاران زیاتر لە ژێر کاریگەریی هەست و سۆزی خودا بووم تا کاریگەریی ئاوەزو لۆژیك. لەوەیە لەو سەردەمەدا وێنایەکی وردم لەمەڕ ژیان، بارودۆخی وڵات، خەبات و تێکۆشین نەبووبێ... هەندێ لە چیرۆکەکان کاردانەوەیەکن لە هەنبەر هەستێك..."

دیاره مەبەستی عەلەوی لە (کاردانەوە لە هەنبەر هەستێك) هەمان شێوازی ئەکسپرسیونیزمی ئەڵمانیە کە عەلەوی بە گەنجی لە ژێر کاریگەریا بووەو هەرگیزش لێی دەرباز نەبووە، چونکە ئەمە لە رۆمانی (چاوەکانی)شدا دووبارە بووەتەوە. ئەوەتا لە چیرۆکی (سەربازی قورقوشمین)شدا دووبارەی دەکاتەوەو دەڵێت: "ئەم تریفەی مانگە دەڵێی چڵکی سپیەو رژاوەتە سەر شەقامەکانی باشوور، و ئەم عەبا رەشانە کە لە کەناری کۆڵان و کوچەکاندا لە سەرما بەدیوارەوە چەسپیون دەڵێی خوێنی قەتماغە بەستووی سەر زامانن.." بە ئاشکرا سێبەری ئەکسپرسیونیزمی (شنیتسلر، دۆستوفسکی، تورگنێف و رەنگە چیخۆف)ش بەسەر ئەم چیرۆکانەوە دیارە، خۆ ئەگەر لێکچوونیان دەگەڵ کورتە چیرۆکەکانی هیدایەتیشدا هەبێ، لەبەر ئەوەیە کە هیدایەتیش لە کاریگەریی دۆستوفسکی و چیخۆف.. بەدەر نەبووە.عەلەوی بەخۆی دەڵێت: "من نە داهێنانێکم کردووەو نە پەیامێکم هەبوو. کارەکانی من زادەی ئەو پێداویستیانە بوون کە خۆم هەستم پێدە کردن.. نەسلی ئێمە کاری خۆیان لە ژێر کاریگەریی نووسەرانی ئەوروپایی دا دەست پێکرد.. من لە سەرەتای لاوییەوە، ئاشنای ئەدەبیاتی ئەوروپایی بووم، بتەوێ و نەتەوێ کەوتوومەتە ژێر کاریگەریی بەرهەم و رێبازو رێچکەیان..." لە شوێنێکی تردا دەڵێت: "من چەندین ساڵی یەك لە دوای یەکەم دەگەڵ هیدایەت دا رابواردووە، ئەو کتێبانەی دەمان خوێندنەوە دەمان دا بە یەکتر، هیدایەت دڵبەندی دۆستۆفسکی، تۆماس مان، چیخۆف و هرمان هسە بوو".

بە هەر حاڵ هیدایەت و عەلەوی هەر یەکەیان هەوڵی داوە بە شێوازی تایبەتی خۆی سوچ و لایەنێکی کۆمەڵگەی خۆی بهۆنەرێنێ.. بۆیە دەبینین لە هەر چیرۆکێکی کۆ چیرۆکی (چمدان)دا مەسەلەو دۆزێکی کۆمەڵایەتی یان مرۆڤانی یان هەندێ جار رەخنەوانی خراوتە روو، بەڵام لە چیرۆکی (چەمەدان)و (سەربازی قورقوشمین)دا مۆرك و رەنگی سێکسی ئاشکراترو تۆخترە، عەلەوی لەم چیرۆکانەوە لە دەلاقەی سایکۆلۆژییەوە دەڕوانێتە واقیع. دیارە خودی ئەم نۆڕینە لە نرخ و بایەخ بەدەر نییە، و لە شیکردنەوەی بەرهەمی هونەریش دا ناکرێ چاوپۆشی لە دەستکەوتە سایکۆلۆژییەکان بکرێ. بەڵام باسی مەسەلەی سێکسی دەبێ دەگەڵ رەوتی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی دا هەڤبەند بێ نەك بە شێوەیەکی تەجریدیی و دابڕاو بێ و هیچ پەیوەندییەکی بە دیاردەکانی ترەوە نەبێت..

بە هەر حاڵ خودی نووسەر هەندێ جار زۆر بە زەقی لە بەرهەمەکانیا رەنگ دەداتەوەو بەرهەمەکە شەقڵێکی خودی وەردەگرێت، دیارە ئەمە سەبارەت بە عەلەوی بەو زەقیە نیە، و لە پەناوەو لە قالبی گوتیاری چیرۆکدا دەردەکەوێ. بۆ نموونە ناتوانرێ کوڕە لاوە لە باب بێزارەکەی ناو چیرۆکی چەمەدان، خوسرەوی سیلاوی و رەشبین-ی ناو چیرۆکی قوربانی، ئارداشس-ی غیرە کردوو لە براکەی (چیرۆکی کورتە مێژوویەکی ژوورەکەم)، (ف)ی ئاشقە دایك لە چیرۆکی (سەربازی قورقوشمین)دا بە خودی عەلەوی بزانرێن. لەوەیە هەندێ لایەنی پەراگەندەی ژیانی عەلەوی بە کاڵی لەم چیرۆکانەدا رەنگی دابێتەوە، بەڵام هەرگیز گومانی ئەوە نابرێ کە خودی عەلەوی بە تەواوەتی لەم چیرۆکانەدا رەنگی دابێتەوە. مەنەلۆگ لە

هەنـدێ چـیرۆکی زۆر کەمـدا نـەبێ، ئیـدی لـە بەرهەمـەکانی عەلـەوی دا کەمـە.. شـێوازی نووسینەکانی عەلەوی لە هەوەڵەوە تا کۆتایی هەر رۆمانتیکی و شاعیرانە بووە، بەڵام عەلـەوی لـە زۆربـەی چـیرۆکەکانیا ویـڕای رۆمانتیکیـەتی گوزارشـت و دەربـڕینی شـاعیرانەی، وەکـو چـاودێرێك دەردەکـەوێت و هەوڵـدەدات خۆشـی و ناخۆشـی خـەڵکی لـە قـاڵبی چـیرۆکانی رۆمانسـیانەدا دابڕێـژێ..و ئـەویش وەکـو هیدایـەت و گوڵسـتان و دەوڵـەت ئابـادی، سـوود لـە نیروی رۆمانسیانەو شاعیرانەی پەخشانی فارسی وەردەگرێ و هەندێ جار پەخشانی وەها دەنووسێت کە شان لەشانی جوانی شیعر دەدات.

عەلەوی بە ژیانی پڕ لە هەورازو نشێو، پڕ لە کەوتن و هەستانەوە کۆمەڵێك پەنجەرەو دەلاقەی لە رووی کەلتووری هاوچەرخی ئێران کردەوە کە ئەگەر ئەوانە نەبوایەن، بۆشاییەك دەکەوتە ئەدەبیاتی تازەی ئێرانەوە.

بە هەر حاڵ کۆ چیرۆکی چمدان (جانتا) هـەر چەندە یەکەمین بەرهـەمی چیرۆکڤانی عەلەوییـە، نێوەڕۆك و تان و پـۆو بونیـادێکی بەهێزو مکومی هەیـەو وەکو چیرۆکنوسێکی بەرجەستەو بـە سەنگ و ئیحتوبار، عەلەویی بە کۆمەڵگای رۆشنبیریی و کتێب خوێنی ئەو رۆژگارە ناساند.

## بـۆ نووسـین و ئامـادە کردنـی ئـەم پێشـەکییە سـوود لـەم سەرچاوانە وەرگیراوە:


١- بزرگ علوی، چمدان، چاپ چهارم ١٣٨٧ (٢٠٠٨) مؤسسة انتشارات نگاه

٢- دکتر فدوی الشکری، واقعگرایی در ادبیات داستانی معاصر ایران، چاپ اول ١٣٨٦ (٢٠٠٧) مؤسسة انتشارات نگاه.

٣- داستان نویسان معاصر ایران، محمد قاسم زاده. چاپ نخست ١٣٨٣ (٢٠٠٤)، انتشارات هیرمند.

٤- نقد آثار بزرگ علوی، عبدالعلی دستغیب چاپ اول ١٣٥٨ (١٩٧٩)، انتشارات فرزانه.

٥- صد سال داستان نویسی ایران جلد ١، حسن میر عابدینی، چاپ اول ١٣٧٧ (١٩٩٨) نشر چشمه.

# جانتا

بەیانییەکی رۆژی یەکشەممەی مانگی چواری هەتاوی بوو، ئاسمان و هەوای شاری بەرلین بە تەمتومان و خەفە بوو. پیاو لەبەر گەرما، لە نێو جێگەدا گێنگڵی دەدا، نەدەحەوایەوە، ئارەقە لە شییەوە هەڵدەقولا. بەڵام حەزی نەدەکرد لە جێگا بێتە دەر. دوکەڵی کارخانەکان و تەمومژی بێشەکان کە ئاوێتەی یەکدی دەبوو، و لە پەنجەرەوە دەهاتە ژوورەوە، لە تۆ وایە دەیویست گوشاری پتر بخاتە سەر لەش و گیانی بنیادەم. من هەنگێ لە بەرلین دەم خوێند. نیو سەعاتێك بوو کە خاوەن ماڵەکەم تاشت و بەرقلیانەکەی لەسەر مێزەکەم دانا بوو، لێ من خەیاڵی رابوونم نەبوو. یەك دوو جاریش لە پشت دەرکەکەوە گوتبووی: "ئاغا، لە ماڵی بابتەوە، بە تەلەفۆن تۆیان دەوێ". لێ من وەڵامم نەدابووەوە.

سەعات نۆ، یەکێك بەلەز لە دەرکەی ژوورەکەی دام و وەژوور کەوت. من هەوەڵجار بەو گومانەی کە خاوەن ماڵەکەیە و کارێکی هەیە، گوێم نەدایێ، لێ پاشان کە لە ناکاو گوێم لە دەنگی بابم بوو، لە جێ راپەڕیم، سڵاوم کرد. لەسەر کورسیە نەرمەکەی سوچی ژوورەکە دانیشت، قوتووە زێڕینەکەی دەرهێنا، جگەرەیەکی داگیراندو گوتی: "ژوورەکەت بۆ وا شێواو تێکەڵ و پێکەڵە، بۆچی ئەم کتێبانە کۆ ناکەیتەوە؟ تەماشاکە: "سابون و قەڵەم وشانەو قەرەویتەو دارجگەرەو نازانم چی، وێنە، هەموو بەسەر یەکدا رژاوە". بابم تازە ردێنی تاشی بوو، عەتری لە خۆی دابوو، بۆنەکەیم لەگیان ناخۆش بوو. راستی دەکرد. وردی و زاکونی ئەو، ویقارو قۆڕە دەماخی ئەو، ئەو ویقارو مەندییەی لە باب و باپیرانەوە بە میرات بۆ مابووە.

ویقاری وشك و فەرمیانەی ئەو، دەگەڵ ژیانی شێواو پەرێشانی من، دەگەڵ دڵی چەپەڵی مندا بە هیچ کلۆجێ تێکی نەدەکردەوە. لە ماڵەکەی ئەودا، قەفەزەو چاوەیەك بۆ سابوون، یەکێك بۆ جگەرە، ژوورێکیش بۆ کتێب تەرخان کرا بوو.

سەبارەت بە باوکم ئەمڕۆی لە هەموو رۆژەکانی دی پێ تەوهین ئامێزتر بوو، چونکە باوکی بە ویقارم خۆی بچووك کردبووەوەو هاتبوو بۆ ماڵی من، مەگەر من هەر ئەو کوڕە نیم کە دوای ماوەیەکی زۆر لە قەرقەشەو خوتەو بۆڵە تۆرا بووم و ماڵەکەی ئەوم بەجێ هێشتبوو، چونکە حەزم لێ نەبوو هەموو رۆژێ لە سەعات یەکی پاش نیوەڕۆدا فراڤین بخۆم و هەر شەوێك سەعات یازدە لە ماڵەوە بم و بخەوم و بەیانی لە سەعات حەوتدا لەسەر مێزی تاشت ئامادە بم.

تا ئەو جگەرەکەی کێشا، منیش سەروچاوم شت و هاتم لەلایەوە دانیشتم. لێی پرسیم: "بە تەمانیت ئەم هاوینە سەفەرێك بکەی؟"

نەمزانی بابم مەبەستی چ بوو؟ ئایا دەیویست بڵێت: سەفەربکە یان لەگەڵ مندا سەفەر بکە. بۆ وەی بە راشکاوی وەڵامی پرسیارەکەی نەدەمەوە، گوتم:

- من پارەم نییە، تۆ ئەم مانگە شتێك زیادەم بدەیە.
- یانی باش بوو هاتم بۆ ئێرە.
- ئەگەر تۆم نەدیتبا قەرزم دەکرد.

چونکه دەمزانی بەقەرز کردن قەڵس دەبێ، بۆیە بە ئانقەست دام بە روویدا کە بە پارەکەی سەرکۆنەم نەکات.

بابم پاش خامۆشییەکی کەم- ئەم خامۆشییە، ئەم عادەتە ناخۆشەی، بۆ من جۆرە عەزاب و ئەشکەنجەیەك بوو، ئەم حاڵەتەی چاوە سوورو درشتەکانی کە دەیوست ، ئەگەر توانیبای، بم سوتێنێ، ئەم حاڵەتی چاوە، کە شوێنەرای زوڵم و دەسەڵاتی باوکی سەردەمی بەربەریەت و هۆڤیەتی بوو، بۆ من کوشندەو ناگەوار بوو، بابم پاش ساتێکی بێدەنگی دەفتەر چەکێکی لە بەرکی دەرێناو چەکێکی سەد مارکی دامێ و گوتی: "من لەسەر سەفەرم و دەڕۆم بۆ دەوروبەری سیتو، بۆ یەکێك لە هاوینگەکانی سەرسنووری چیکۆسلاڤ (ناوەکەیم بیر چووە) قیتار سەعات یازدە دەردەچێت، ئەگەر دەتوانی بڕۆ بۆ ماڵەکەی من و لەوێ دانیشە تا کوڕی خاوەن ماڵەکەم، جانتاکەم بۆ وێستگە ببات. خۆ ئەگەر حەزیش دەکەی ئەوا جانتاکەی من لەگەڵ خۆتا بێنەو سەعات یازدە لەوێ بە تا پێکەوە سەفەرە بکەین".

بێ ئەوەی تەمەشای ئەو بکەم گوتم: "زۆر چاکە".

- چۆنی زۆر چاکە؟ بە خۆت دێی، یان بەو کوڕە دەڵێی جانتاکەی من ببات؟
- بە خۆت ناتوانی جانتاکەت ببەی؟

گڕ لە چاوانی بووەوە. بەڵام خۆی لە ساڵۆزی دا، وەکو خووی هەمیشەی بە کەماڵی ئارامی و خوێنساردی گوتی: "من پێشتر لە شوێنێکی دیدا کارم هەیە، هەنووکە سەعات نۆیە، سەعات نۆو نیو لە شوێنێك کارم هەیە".

- زۆر چاکە من چایەك دەخۆم، پاشان دەچم بۆ بانق و لەوێندەرەوە دەچم بۆ ماڵەکەی تۆ، لەوێ دەبم تا کوڕی خاوەن خانووەکەت جانتاکەت بۆ وێستگە ببات و بگەڕێتەوە.
- ئەگەر بتەوێ بۆ بانق بچێت درەنگ دەبێ.
- بۆ نەگبەتی هیچ پارەم پێ نییە.

پێکەنی. منیش پێکەنیم. دە مارکی دیکەی دامێ. سوپاسم کرد. باوکم رۆیی، کەمێك دڵتەنگ بووم. بابم یادگارێکی باشی دنیای کون بوو، بەڵام نەك سەرو سیمای! عەترەکەی، قەرەویتەکەی، هی ئەم رۆژگارە بوو، مۆدی رۆژ بوو، بەڵام بیرۆبۆچوونەکانی! دەبێ سەعات یازدە فراڤین بخوات... دەنا... دەنا سیستەم و شیرازەی ژیان تێك دەچێت.. ویقارو قوڕە دەماخی ئاسیو دەبینێ، خانەوادە لە بەین دەچێت، دەبێ پرەنسیبی پیرۆزی بنەماڵەو خێزان رەچاو بکرێ. چەند باشە کوڕو کیژی بنیادەم هەموو لە دەوری یەکدی خڕ ببنەوە، قسان بکەن، و باوك، گەورەی خێزان، لەسەری سەرەوە دانیشێت و فەرمان بدات، بێن ،بڕۆن. باوك خواوەندی ماڵە. رێك رەنگدانەوەی مەزەب لە خێزاندا یا بە پێچەوانەوە. رێك دنیای کۆن!

جلەکانم لەبەر کردو کەوتمە رێ. رەنگی تاریك و لێڵی شەقامەکانی بەرلین، ئەم حاڵەتە تایبەتییەی ئەم شارە لە مانگی هەشتدا. جا لە هاوینێکی خەفەدا، خەریك بوو دەیکوشتم. ئایا لەگەڵ بابمدا بۆ ئەم هاوینگەیە بڕۆم؟ ئەم سەرو سیمایە، ئەم عەترو عوتورە بە خۆڕایی نییە! بۆ سەر سنووری چیکوسلاڤ دەڕوات، چۆنە؟ منیش لەگەڵیا دەڕۆم، باشە چەند رۆژێك

لەوەپێش ئەو خانمە روسییە... ناوی چی بوو؟ کاتوشکا.. کاتوشکا.. ئوسالوڤنا.. کە خوا حافیزیمان لێکدی کرد، کاتیٚ کە دەستە سپی و باریکەکەی، ئەو قامکە رەقەڵە درێژانەی لە ناو دەستی من نابوو، دەیگوت: "با یەکتر بدینینەوە، من بۆ سیتو دەچم، تۆش وەرە بۆ ئەویٚ"، دویٚ شەو کاتیٚ کە ئەو دەموچاوە سپی و لاوازە لە هەمێزی مندا بوو، کاتیٚ کە گۆنا زەقەکانی بەروومەتی منەوە نابوو، لەبەر خۆیەوە هەندیٚ شتی دەوت؟ مەرایی بۆ من دەکرد!نە مەرایی نەبوو، لەو حاڵەتەدا نەدەکرا درۆ بکریٚ و نە هەست بە درۆ بکریٚ، چی دەکرد؟ چنگی دەهاویشت و قژی منی دەڕنیەوە، پێی دەگوتم: "تۆ لە هەموو خەڵکی جیاوازی؟".

لە ناکاو لە ناوەڕاستی شەقامەکەدا بە دەنگی بەرز دەسەتم بە پێکەنین کرد، سەیرم کرد دیتم پتر لە یەك سەعات بە ختوخۆڕایی بە شەقامەکاندا سوڕاومەتەوە، لە ماڵەکەی بابیشم تیٚ پەڕیووم. ئوتۆمبیلێك هات و سوار بووم.

نەرمە تەکانی ئوتۆمبیلەکە، منی وەکو منداڵێك کە لە بێشکەیان نابیٚ، بە ئارامی کردە خەو، بەڵام خەوێك کە پڕ بوو لە بویەرو رووداوی جۆراو جۆر. کاتوشکا.. ئوسالوڤنا.. بۆ کویٚ دەڕوات، بۆ سیتو؟ بۆ سیتو؟ ئەم ناوەم ئەمڕۆش بیستەوە، ئێرە هەمان شوێنە کە بابم بۆی دەچیٚ. چۆنە، لەگەڵ بابمدا دەڕۆم، یانی، لەگەڵ بابم دا دەڕۆم بۆ سیتو بۆ دیدەنی کاتوشکا ئوسالوڤنا.. ئەم ناوە خۆی لە خۆیدا ئاهەنگدارە، کاتوشکا... ئوسالوڤنا. بەڵام ئەوە دێنیٚ کە پیاو وەختی خۆی دەگەڵ ئەم روسانەدا رابوێریٚ. لەگەڵ ئەم روسە موهاجیرانەدا! جاچی بۆ من باس دەکرد، باسی دۆك، پرنس، دەربار، راسپۆتین، باسی تزار، باسی تولستۆی، باسی سیبریا، دەیزانی کە من پێچەوانەی ئەوم، دەیزانی کە من تەنها لێوانی ئەوم دەویست، نەك ئەو جەواهێراتەی کە لە سینگیا دەدرەوشایەوە. کاتیٚ کە من پێچەوانەی گوتەکانی ئەوم دەگوت، قامکی لەسەر لێوەکانم توند دەکرد، تا چیتر قسە نەکەم، چاك دەیزانی کە من گاڵتەم بە هەموو قسەکانی ئەو دێت. دەیزانی کە من قسەکانی ئەو بە درۆ دەزانم، و حەقیقەت و راستیم لە پشت پەردەی قسەکانی ئەوەوە دەدۆزییەوە، لەگەڵ ئەمەشدا خۆشی دەویستم. ئێستاش خۆشی دەوێم. ئەسەح؟!

شۆفێرەکە پرسی: "ئەزبەنی کێوە بڕۆم؟"

– سەعات چەندە؟

– سەعات دەو نیوە.

– بڕۆ بۆ ئولاندشتراسە ٢٨

بڕیارم دا بۆ سیتو بڕۆم. بەڵام تازە فریای بابم نە دەکەوتم. هەوەڵجار چووم بۆ ماڵەکەی جانتاکەم لە ئوتۆمبیلەکە نا، پارەم لە بانق وەرگرتو بە ئوتومبیل سەعاتی یەکی پاش نیوەڕۆ بە جانتاکەی ئەوەوە بەرەو ئەو شوێنە وەڕیٚ کەوتم کە بابم بۆی چوو بوو.

*　　　*　　　*

چونکه ئوتومبیلەکە. لە گورلیتس دا نزیکەی سەعاتێك پشووی هەبوو، لای عەسر گەییمە سیتو و لەوێندەرەوە بە قیتار چووم بۆ ئەو هاوینگەیە. جانتاکەم لە وێستگەکە دانا، لە میوانخانەکانی هاوینگەکەدا (تەنێ دوو میوانخانەی لێ بوو) سۆراغی کاتوشکام کرد. لە میوانخانەی (ماڵی سەوز) لایدابوو. لەوێ ژوورێکم بۆ خۆم گرت. کاتوشکا لەگەڵ دایکی و ژنێکی دیکەدا دوو ژووریان لە (ماڵی سەوز)گرتبوو.

دوای سەعاتێك لەسەر کارتەکەم نووسیم: کاتوشکای ئازیز، من ئێستا گەییومەتە ئێرە حەزم لێیە بت بینم، کات و شوێنێك دابنە، ف.

لە زەنگم دا پێشخزمەتەکە هات، کیژێکی نۆزدە ساڵی سەرو قژ زەردی چاو رەش بوو، کە کارتەکەم دایە دەستی بزەیەکی هاتێ و گوتی: "ئەزبەنی تۆ ئاغای ف نیت؟ ئەم خانمە چوار رۆژە هاتووەو رۆژ نەبووە سۆراغی تۆی نەکردبێ.

– بۆچی لە تۆ؟

– ئاخر من خانمم خۆش گەرەکە، پارەکە لێرە بوو، کتێبێکی بە دیاری دامێ، دیارە شتی دیکەش هەیە.

پرسیم: چ شتێکی دیکە هەیە؟

– خانم هەندێ رازو نهێنی لای من هەیە.

– تۆ ناوت چییە؟

– فەردیل

– ئێ فەردیل، تۆ پێم ناڵێی چ رازگەلێکی هەیە؟

– ئەوەندە پێ دامەگرە.

– زۆر باشە، مادام حەز ناکەی مەیڵێ.

کیژەکە کەمێك لە فکرانڕا چوو و گوتی: "نە، پێتی دەڵێم، چونکە دەزانم کە کاتوشکا خانم تەنیا تۆی خۆشدەوێ، لەو رۆژەوە کە کاتوشکا خانم هاتووەتە ئێرە، هەموو رۆژێ سۆراخت دەکات. ئەمڕۆ پیاوێك هاتە لای خانم، ئەم پیاوە ماوەیەك لەمە پێشیش کە خانم لەگەڵ دایکیا بۆ بەکرێ گرتنی ماڵ تەشریفیان هێنا بوو، لەگەڵیان بوو، بەڵام خانم خۆشی نەگەرەکە، بە ئەقڵم ناچارییە، عەسرێك دەیگوت، کەی رۆژێ بێ ئاغای ف بێت."

ئەسکەناسێکی دوو مارکیم لە بەڕکم دەرێناو بە ئاسپایی خستمە دەستی فەردیلەوە، پاشان پرسیم: "باشە فەردیل، ئەمە چۆن پیاوێکە؟"

– وەڵڵا، ئەمەیان نازانم، من بە باشی لە نزیکەوە نەم بینی.

– زۆر باشە، فەردیل ئێستا بچۆ ئەم زەرفە بگەیەنە بە خانم، بەڵام بە جۆرێ بیدەیە کە کەس پێ نەحەسێ.

وەکو ئەوە بوو ئاوێکی ساردی پێدا بکەن... بیرم لەوە کردەوە لەم میوانخانەیە بڕۆمو بچم بۆ ئەو شوێنەی کە بابم لێی دابەزیوە. ئیدی ژنان هەموو وەکو یەکن، گریانیان، پێکەنیان، هەمووی هەر درۆیە! ئەگەر کاتوشکا درۆزن بێ، کەواتە هەرچی ژنی دی هەیە درۆزنن، ئەم

چاوه پرشنگدارانه چۆن درۆ دەکەن! جا ئەگەر ئەم چاوانە، ئەم گۆنانە منیان خستە داوەوە، ئەو نەفەرەش بۆ خۆی ئاشقێکی جوانە، ئاخر من چ شتێکم لەو زیاترە.. من چ شتێکم لەو زیاترە، بە چیا لەو زیاترم، رەنگە بەڕاستی منی خۆش ویستبێ، بەڵام بە دڵنیاییەوە پارەو پولی ئەو لە من زیاترە، جا لێرەوە یەکەمین بەردی بناغەی پیرۆزی خێزان دادەنرێ.
بریا زەرفەکەم نەدابایە، حەیف نییە پیاو خۆی سووك بکات؟ بە خۆڕایی کارتەکەم بۆ نارد، بەڵام چونکە ئەم کچۆڵەیە ئاگاداری شتەکان بوو، هیچ کارێك نەدەکرا، فەردیل گەڕایەوە. لەسەر کارتێك بە نێوی کاتوشکا ئوسالوڤنا ، کاتۆشکا ئەمەی نووسی بوو: "دایکم حەز دەکات تەعاروفت لەگەڵ بکات، و تکای وایە کە بۆ شیو بێیتە ماڵەکەی ئێمە".
.... جا ئێستا دەبێ جل بگۆڕی، دەبێ ئەتەکێتی ئەدەب بەجێ بێنی، دەبێ دەستی دایکی ماچ بکەی... من هاتووم گۆناکانی کاتوشکا ماچ بکەم، من دەخوازم چاوەکانی ئەو بدینمم، چۆنە؟ ئەمشەو عوزر دەخوازم، دەبێ بچم بۆ لای بابم، پێشتر قەولم داوەتێ، کاتوشکا ئوسالوڤنا ئەم ناوەم بە دەنگی بەرز درکاند، لە دەمم دەرپەڕی...
دەرکەی ژوورەکەم ڤەبوو و کاتۆشکا وەژوور کەوت، بەرەو لای من هات و گوتی: "ئاخری هاتی؟ من هیچ بە تەما نەبووم" کە گوێم لە ئاهەنگی ناسکی دەنگی بوو، هەموو ئەو شتانەی کە تا ئێستا سەبارەت بەو بیرم لێ دەکردەوە، لە یادم ڕەڤی. دەستیم ماچ کرد. لەسەر کورسییەکی نەرم دام نیشاند، گوتم: "بزانە چۆن هاتم".
من لە قەراغ کورسیە نەرمەکە دانیشتبووم، دەستم لە ملی کردبوو، تەمەشای کردم و گوتی: " من هیچ بە تەما نەبووم".
- بۆچی؟
- بۆچی؟ چما تۆ ناناسم؟ تۆ هەمیشە خەو دەبینی، تۆ هیچ کاتێك بێدار نیت، ئەوەی کە هەنووکە من بە تۆی دەڵێم، رەنگە هەر نەی بیستی.
راستی دەکرد، من تەماشای گوڵە یاخە سوورەکانی سەر کراسە سپیەکەی ئەوم دەکرد، من لەزەتم لەپشت ملە رێکەکەی کە شاڵێکی رەشی لە مل کردبوو دەبینی. من تەمەشای برژوڵە رەشەکانیم کە چاویان داپۆشی بوو، دەکرد، گوێم لە قسەکانی نەدەگرت، چونکە قسەی زۆر ئاسایی بوون، من چاوانم بڕی بوونە چاوەکانی، پاشان گوتی: "من بۆیە خۆم هاتووم بۆ ئێرە تا تکات لێ بکەم کە دەعوەتەکەی دایکم رەت نەکەیەوە".
- لە کوێ دەتزانی کە نایەم؟
کاتوشکا پێڵوی چاوەکانی کەمێك وێك هێنایەوە و گوتی: "من دەزانم کە تۆ حەزت لەم تەشریفاتکاریانە نییە".
دەماری ناسی بووم. (چۆن بەم باشیە دەمناسی؟) ئەم پرسیارەی من جۆرە سوکایەتییەك بوو بەو، ئەو کچە زۆر هەستیار بوو، بەڵام هەستی درۆینەی نەبوو (ئایا شتی وا دەبیٚ؟) یان کەمترە.

– تۆ پێت وایە کە یەك مانگە یەکتر دەناسین. من لەو ساوە کە خۆم ناسیوە تۆش دەناسم. یەکەم جار تۆم لە کوێ دی؟ لە خەوا! بەڵێ لە خەوا، وا بزانم ئەوسا پازدە ساڵان بووم، من هەمیشە ئاشقی چاوانی رەشی وەکو چاوانی تۆ بووم، من هەمیشە قژی زەردی وەکو قژی تۆم خۆش ویستووە. بیرت دێتەوە لە یەکەم شەوی ئاشنایەتیماندا چم گوت: من ئاشقی وەهم و خەیاڵێك بووم و ئەمێستا ئەو وەهم و خەیاڵە لە تۆدا، لە هزرو بیری پەرێشانی تۆدا، لە ژیانی تۆدا، لە روحی بێ قەراری تۆدا، جیلوەی کردووە، تۆ ئاگات لە ژیانی من هەیە. ئێوە خەڵکانی تایبەتین. من دەزانم کە تۆ بۆ هەمیشە منت خۆشناوێت، شەپۆلێکی دێ و دەڕوات، شەپۆل دەڕوات، بەڵام ئاو لە جێی خۆی دەمێنێ، تۆ من لە بیر دەکەیت، وا نییە؟ بەڵام من لە بیرت ناکەم. من بە ئاوات و ئارەزووی خۆم گەییوم. ژیانم بە فیڕۆ نەچووە، تا ئێستا بە ڤیانی ئەم وەهم و خەیاڵەوە دەژیام. لە ئێستا بە دواوەش بە یادی ئەم رۆژانە دەژیم، تۆ ناتوانی ببی بە مێردی من، تۆ چۆن دەتوانی تەمەنێك لەگەڵ مندا رابوێری؟ بەڵام ئەو دەقیقەیەی کە من لەگەڵ تۆدام.. ئەو دەقیقەیە... گریان گرتی: "هەرچییەك بێ من دەبێ بژیم، دەبێ شوو بکەم" ئێستا لەمەسەلەکە تێگەیشتم. ئەو پیاوەی کە تازە ئاشنایەتی دەگەڵدا پەیدا کردووە، لەوەیە بیخوازێ، ببێ بە مێردی. لەوەیە ئەگەر کاتوشکا بە خۆی بیتوانیباو هۆکاری دی ناچاریان نەکردبا، بێ ئەوەی ببێ بە ژنم. لەگەڵ مندا بژیایە. ئێستا نە باوك و نە دایك، کەس ئەوی ناچار نەدەکرد، بەڵام دێوێکی نەحس و شوومی شپرێوی ترسناك، پارە، کۆمەڵگە، ژینگە ئەویان ناچار دەکرد کە بڕوات خۆی بفرۆشێت، بۆ تەمەنێك خۆی بفرۆشێت، تەنیا لەبەر ئەوەی بتوانێ بژی، ژنان هەموو خۆیان دەفرۆشن، هەندێکیان بە پارەیەکی کەم و بۆ ماوەی چەند سەعات و رۆژێك، هەندێکیان بۆ ماوەی عومرێك بەرانبەر بە دابین بوونی ژیان.

– مەگری کاتوشکا، ئێستا تێ دەگەی بۆ لە دنیای ئەو بێزارم.

لە قسەکەم حاڵی نەبوو، لێی پرسیم: "کەی بت بینم".

گوتم: "دوای شیف دەتوانین پیاسەیەکی کەم بکەین؟"

– زۆر چاکە، دوای شیڤ خارن.

* * *

شیڤ دەگەڵ داکی کاتوشکاو ئەو خانمەی دیدا بە شێوەیەکی گشتی ناخۆش بوو، پاش شیڤ من و کاتوشکا چووینە پیاسە، پتر لە نیو سەعاتێك رێمان کرد، دنیا تاریك بوو، بە ئەسپایی بە نێو جەنگەڵی دار سەرووانداا رادەبوردین، تەنکە هەورێك ئاسمانی شین هەڵگەڕاندبوو. رێگەکان چۆڵ و بێ دەنگ بوون. لە دوورەوە دەنگی سەگوەڕی سەگانی دێهاتیەکان دەهات. کاتوشکا شیعرێکی روسی لەبن لێوانەوە دەگوتەوە، من گوێم دەگرت. نیو سەعاتێکی قەتیا. لەسەر گردێك لە نێو جەنگەلەکەدا دار بەستێکیان دانا بوو. کاتوشکا شەکەت بووبوو، لێم پرسی:

– دەتەوێ کەمێ لێرە دانیشین؟

- خراپ نییە.
- باچینە سەر دار بەستەکە.
- دەترسم بکەوم.
- مەترسە دەتگرم ئێرە بۆگنخە، ئەوسەرە هەواکەی باشترە.

دار بەستەکە پێنج پاچینەی هەبوو، کەپێی نایە سەر یەکەم پاچینە، شریقەیەك لە داربەستەکە هەستا. ئەوجا دەستم گرت و سەرکەوتە سەرەوە، رەشەداری زەلام چوار دەوری گرتبووین. سەری درەختەکان وەکو شەپۆلی ئاو دەجمان، کاتوشکا هەمدیس کەوتە نەرمە گۆرانی. گۆرانی روسی دەگوت، نەرم، بەڵام زندوو. دەستیم لە دەستم کرد

- کاتوشکا!

لە جیاتی ئەوەی وەڵامم بداتەوە سەری خستە سەر شانم. چەند حەزی دەکرد کە ئەم خامۆشییە زوو تەواو نەبێ. پاش ماوەیەك لێی پرسیم:

- چۆن بوو بۆ ئێرە هاتی؟
- یەکەم، بەڵێنم بە تۆ دابوو.

قسەکەی بریم: "ئەی دووەم..."

- دووەم باوکم هاتووە بۆ ئێرە، ومنیش هاتم.
- ئەدی بۆ تا ئێستا قسەت نەکردووە؟
- قسەی ناوێ، تۆ ئەوەندە باوەڕت بە دایك و باوکت هەیە. دەزانی من بە پێچەوانەی تۆ بیر دەکەمەوە. لە هەموو شتێکدا.
- بە یەکترمان بناسێنە، شەرم دەکەی؟
- شەرمی چی، من حەز ناکەم، ئەگەر تۆ مەیلت لێیە، سبەی... دەموچاوی لە بەرۆك و سینگم دا پەنهان کرد، گوتی: "سبەی نابیّ".
- بۆچی سبەی نابیّ؟

هەروەك دەستی لە گەردنم وەرینا، ماچێکی کردم و گریا، دەستەکانیم لە گەردنی خۆم هەڵگرت، بە هەرتك دەستان گۆناکانیم گرت، لە تاریکییەکەدا نیگایەکی چاوەکانیم کردو گوتم: "مەگری کاتوشکا، من دەزانم، لە قسەکانی ئەمڕۆت حاڵی بووم، دنیای تۆ بەمجۆرەیە، منیش تۆم خۆش دەوێ، من ئەوەندەم خۆش دەوێی کە ناتوانم بتکرم. وا چاکە هەر بەم وەهم و خەیاڵەی خۆمانەوە بمێنینەوە. ئەم وەهم و خەیاڵە خراپ نییە، سوکنایی بە دڵی مرۆڤ دەدات، جورئەت و هێڤی بە بنیادەم دەبەخشێت. سبەی دەتەوێ دەگەڵ تازە ئاشناکەتدا بچیتە گەڕان، زۆر چاکە، سبەی شەو یەکدی دەبینینەوە".

- وا نەزانی کە من سبەینێ بە تەنێ لەگەڵیا دەبم، دایکم لەگەڵماندایە، سبەی شەویش لە میوانخانەی (ئەسپی سپی) میوانی ئەوین. وەرە، سبەی شەو پێتی دەناسێنم. ئەگەر منت خۆش گەرەکە، رای خۆتم دەربارەی، پێ بڵێ.

– زۆر خاسـه، کاتوشـکا. سبەینێ دەچم بـۆ لای بـابم و سـبەی شـەو لـە میوانخانـەی (ئەسـپی سپی) دەبم.
چ قسـەیەکی ترمـان نـەکرد. بـەرە بـەرە مـانگ هـەڵهات. شـەو درەنـگ بـوو. لەسـەر دار بەسـتەکە هاتینـە خـارێ. ئـەو تـەیرو توانـەی تریفـەی مـانگ مەسـتی کردبـوون، سـەری رازو نیازیـان بـۆ یەکدی دامەزراند بوو، ئێمە گوێمان لێدەگرتن و ئۆخژنمان لە دڵ و دەروونان دەگەڕا.
سەعات یازدە بوو کە من بۆ ژوورەکەم چوومەوە. (فەردیل)م گاز کرد. شـەرابی بۆ هێنـام. دوای ماوەیـەك ئـاوازی گرامـافۆنی ژوورەکـەی تەنیشـتم بـەرز بـووەوە. ماوەیـەك شـەرابم خـواردەوەو جگەرەم کێشا.

*　　　*　　　*

بـەیانی سـەعات نـۆ لـە ژوورەکـەم وەدەرکـەوتم. سـەرەتا کـەمێك لـە داڵانەکـەدا پیاسـەم کـرد. فەردیل، دەسماڵێکی سپی لەسەر بەستبووو لە ژوورەکاندا کاری دەکرد. پێی گـوتم کاتوشـکاو دایکی و ئەو ژنەی دی چوونەتە گەڕان. ئەوسا چووم بۆ ویستگەی قیتار. لەوێوە بە جانتاکـەی بابمەوە سواری گالیسکەیەك بوومو چووم بۆ لای بابم کە لە هەمان (میوانخانەی ئەسپی سپی) لایدا بوو. لە میوانخانەکەی ئێمەوە تا ئەوێ نزیکەی نیو سەعاتە رێیەك بوو. سەعات دەو نیـو گەییمـە ئەوێنـدەر، بـەڵام بـابم لـەوێ نـەبوو. گوتیـان بـەیانی زوو دەرچـووە. مـن جانتاکـەم بـە ئەمانەت لای خاوەن ئوتێلەکە داناو رۆیشتم. لەم گوندەوە بۆ ئـەو گونـد. ئێـوارێ کـە گەییمـەوە میوانخانـەی (مـاڵی سـەون) کاتوشـکا لـەوێ نـەبوو. فـەردیل هـات، ئەمشـەو بـە پێچـەوانەی جارانەوە جلکێکی جوانی لەبەر بوو: "ئەزبەنی، خانمەکان هاتنەوەو رۆیشتن."
– فەردیل ئەمشەو خۆت جوان کردووە.
– بەڵێ، ئەمشەو ئیسراحەتم و دەگەڵ دەزگیرانەکەمدا دەچمە دانس و سەما.
شیڤم خواردو بە پای پیادە بۆ ئوتیلەکەی لەمەڕ بابم رۆیشتم. سەعات نۆ گەییمە ئەوێندەر. کە چـووم بـۆ ژوورەکـەی بـابم، گوتیـان لـە هۆڵەکـەی خوارەوەیـە. لـە پلیکانەکانـەوە دا گـەڕام. کـە دەرکەم کردەوە سـەیرم کـرد کاتوشـکا لـە تەنیشـت بابمـەوە دانیشـتووە. پێشـخزمەتێك خـەریك بوو بوتڵە شەرابە بـە تاڵـەکانی هەڵدەگرتـەوەو بـوتڵی تـری دادەنا. بـابم ردێنـی لـوس کـرد بـوو. کاتوشکا جلکێکی شینباوی لەبەر بوو. لە جاران جوانتر هاتە بەرچام. یەکسەر هاتمە دەرەوە. لەسەر کارتەکەم شتێکم بۆ کاتوشکا نووسی و دامە پێشخزمەتەکە کە بیداتێ.
" کاتوشکای ئازیز، داوات لێ کردبووم کە بابمت پێ بناسێنم، هـەمان ئـەو کەسـە یـە کـە لەسـەر مێزەکەی تۆ، لە دەستە چەپتدا دانیشتووە. داوات لێکردبووم ڕای خۆمت دەربارەی ئـەو شـووە تازەیەی کە بە تەمای هەڵی بژێری، پێ بێژم. مێردێکی زۆر چاکە، بەختەوەرت دەکات. ف."
بە خاوەن ئوتێلەکەم گوت: "جانتاکە هی ئەو پیاوەیە کە لە تەنیشت هۆو خانمە دانیشتووە."

# بووكی هەزار زاوا

رووبـەری ژوورەكـە نزيكـەی پێـنج بـە چـوار گـەز بـوو. بـە قـەد ديوارەكانـەوەو لـە پـەراوێزی بنميچـەكەدا شـريتێكی سـوريان هەڵواسـی بـوو. ئـەو پـەردە شـينباوانەی كـە بـە دەرگاكـانی حەوشەكەيانەوە هەڵواسی بوو، ژوورەكەی تاريك و گەرم دەكرد. لەلايەكی تری ژوورەكەوە، لـە هەنبـەر دەرگـای هاتوچـۆدا، پەردەيـەكی ديكـەی رايـەڵ ئەسـتووری زەردبـاو، سـێ گۆشـەيەكی تاريك و كپی دروست دەكرد. مێزێكی بەرزی باريكيـان لـە ژێريـا دانـا بـوو. تـاق و دەلاقـەكانی پشت مێزەكە پڕ بوو لە بوتڵی بەتاڵی بادەی فەڕەنگی، لـە خانـەكانی خـوار تـرەوە لـە پاكـەت و قوتـوی سـورو زەردی زێـڕينی جقلاتـەو شيرينيان دانـابوو. زۆربـەيان عـال بـوون. لـە فاسـيلەی نێـوان رەفــەكان و مێزەكــەدا ژنێكــی قەڵــەو لەســەر كورســيەكی درێــژ بوتڵــە مەشــروبەكانی دەجوڵانـدو بـە خاوليـەك سـەر مێزەكـەی دەسڕیو خـاوێن دەكـردەوە. دەرێـی ژوورەكـە دالانێك بوو كە دەچووەوە سەر شەقامەكە. فانۆسێكی سوور بەسەر دەرگاكەيەوە جۆلانەی بوو. لەسـەر پارچە مقەوايەك نووسرا بوو: Defendn pour Les Jeunes Persans لێ كەس گـوێی بـەم تابلۆيە نەدەدا.

لەو سوچەی ژوورەكەدا ژنێكی لاوان، بالاّ بەرزو پشتێن لە پشت دانيشتبوو. هەردوو ئانيشـكی دادابـووە سـەر مێزێكـی بچـوك، سـەری بـەديار پەرداخێكـەوە دانەوانـد بـوو، بـە قەسـەبێكی زەردباو شەربەتی سركەی ليمۆی دەخواردەوە. زڵفە رەشـەكانی لـەلای چەپەوە رووی داپۆشـی بوو. چاوەكانی خومارو ماندوو و مردوو دەهاتنە بەرچاو.

سـەعات دە بـوو، كابرايـەكی وێڵـون بەدەسـت وەژوورکـەوت، كڵاوەكـەی لەسـەری داكەنـد، نيگايـەكی ئـەو ئاوێنەيـەی كـرد كـە بـە ديوارەكـەی دەسـتە راسـتدا هەڵواسـرا بـوو، وێڵونەكـەی لەسەر پيانۆكە دانا، چوو بۆ نزيكی ژنە قەڵەوە زەلامەكە، لـەوێ مل پێچـە سـپييەكەی كـردەوە، پاڵتۆكەی داكەندو دايە ژنە قەڵەوە زەلامەكە، قژی لـە پشـتەوە پەشـێوو پەرێشـان دەينوانـد، لـە تۆ وايە هەرگيز شانەو چـاك كردنـی بـە خـۆوە نـەديتووە. ژنەكـە يەكسـەر پـەرداخێ قۆدگـای بـۆ تێكـرد، دايـێ و ئـەويش بەيـەك بـێن هەڵيـدا، ئەوسـا چـوو بـۆ لای وێڵونەكـەی. پـاش چـەند دەقيقەيەك پيرەژنێكی قەبەتر لە ژنە قەڵەوەكە هات. سڵاوی لە هـەمووان كـرد، جانتـا رەشـەكەی لەسـەر پيانۆكـە دانـا، كڵاوەكـەی داكەنـد، دەسـتێكی بەسـەريا هێنـاو لەوێنـدەر دانيشـت. سوسكێ، هەمان ئەو ژنەی كە لە سووچی ژوورەكە دانيشتبوو، بـێ ئـەوەی گـوێ بـە پيـاو يـان ژنـە تـازە هاتووەكـە بـدات، ئـاو ليمـۆی خـۆی دەخـواردەوە. ئـەوانی دی بـە فەرەنسـی قسـانيان دەگەڵ يەكدی دەكرد، چونكە گوێيان بەو نەدەدا، ئەويش فيزی پـێ دەفرۆشتن.

سـازژەنەكە، جانتـای وێڵونەكـەی كـردەوە، كەمانەكـەی لـە گيرەكـە دەركـرد، ئـەوجا دەسمـاڵێكی سپی نايە ژێر چەنەی. سازەكەی كۆك كردو دووبارە نايەوە ناو جانتاكەی. ئەوسا چوو بۆ لای گرامافۆنەكە، يەك يەك بەكرەكانی تەماشا كرد، يەكێكی هەڵگرت.

سوسکیٚ گوتی: "واز بێنه با تۆزیٚ ئاسووده بین، هێشتا دەنگی زیقه زیقی دویٚ شەو لە گوێمدایه".

سازژەنەکە کە دەتگوت تا ئێستا ئاگای لەو نەبوو بوو، گەڕایەوەو نیگایەکی کرد. دەیویست بەکرەکە دابنیٚ کە ژنە قەڵەوە زەلامەکە گوتی: "سوسکیٚ تۆ زۆر خراپی. بۆچی نەخوێنیٚ". مەبەستی ئەمە بوو کە بۆچی ئەوەندە بەدخوویی دەکات. کاتیٚ کە سازژەنەکە گوێی لەمە بوو، دەرزییەکەی نایە سەر بەکرەکەو بۆکەڵەیەکی تایبەتی لەسەر میلی ناوەندی گرامافۆنەکە دانا، کە بەکرەکە دەسوڕایەوە بوکەڵەکەش لەگەڵیا دەخولایەوەو لە ئەنجامی سوڕانەوەدا بایەك دەکەوتە ژێر تەنورە دەڵب و کورتەکەی بوکەڵەکەو بەرز دەبووەوە، پاوپوزی بوکەڵەکە تا نزیکی رانی بە رووتی دەکەوتە ئەو گۆڕە.

هەنگیٚ ژنە قەڵەوە قەبەکە گوتی: "ئەمشەو ئاغای ف لێرەیە. ئیدی پێویست بە گرامافۆن نییە". ئەوجا بە فەڕەنسی بە سازژەنەکەی گوت: "دەمویست گرامافۆنەکە بنێرمەوە. ئەم پیانۆیەمان شەوی بە پێنج تمەن بەکریٚ گرتووە، باشە؟".

ژنە قەڵەوەکە کە لە بەردەم پیانۆکەدا دانیشتبوو دەستێکی بە کلیلەکانی پیانۆکەدا هێنا، دەنگی گرامافۆنەکە ئاوێتەی ئاوازی پیانۆکە بوو.

ژنە قەڵەوە قەبەکە گوتی: "گرامافۆنەکەم بۆ ئەمە هێشتەوە تا ئەگەر مشتەریەکان بیانەویٚ، هەبیٚ. ئەگەر بزانم ژمارەی مشتەرییەکان زیاد دەبیٚ، کرێی زیادەت دەدەمیٚ". ئەو بەکرەیەی کە لەسەر گرامافۆنەکە دەسوڕایەوە، ئاهەنگێکی زیقاوڵەی ناسازی ناخۆشی لێدەدا: " When I washappy".

سازژەنەکە قوتوی جگەرەکەی لە بەرکی دەرهێنا، جگەرەیەکی داگیراند. دوو کەڵەکەی بەرەو زەوی دەنارد، لەم کاتەدا مشتەرییەك وەژوور کەوت، چوو لەسەر کورسییەکی تەنیشت مێزەکەی سوسکیٚ دانیشت، سازژەنەکە جارەکی دی سەرنجی سوسکێی دا. لیٚ سوسکیٚ بە وردی دەیڕوانییە مشتەریە تازەکە، سەراپای دەپشکنی، دەشێت پارەیەکی لیٚ دەربهێنریٚ: "ئاغا چی مەیل دەکەن؟"

– چیتان هەیە؟

خۆیا بوو کە مشتەرەییەکە ناشیە: "هەرچییەکت بویٚ، کۆکتێل، ویسکی، بیرە، شەراب، شامپانیاو ڤۆدگا."

سازژەنەکە ئەبڵەق دەیڕوانیە سوسکیٚ، نیگایەکی گرامافۆنەکەو پاشان پیانۆکەو ئەوجا وێڵۆنەکەی کرد. شتێکی سەیرە! چ پەیوەندییەك لە نێوان ژیانی رابردووی ئەوو ئەم ژوورەدا هەیە: پازدە ساڵی خشتە کە ئەو میناکی دینان لەم شارەوە بۆ ئەو شار دەڕوات. چۆنە وا ئەمشەو ریٚی کەوتووەتە ئەم ژوورە؟ چۆنە وا ئەمشەو کەوتووەتە بیری ژیانی کۆنی. ساز ژەنەکە خۆی بەیەك لە دیارترین مۆزیقازانانی دنیا دەزانی، بەڵام خەڵکی؟ ئەو خۆی بە باش هونەرمەند دەزانی، خەڵکی دەیانگوت کە تۆ موتریب و شایەری. بەڵام خەڵکی هەقی قەزاوەت و داوەریان دەربارەی ژیانی ئەو نەبوو، بۆ نە ء، هەیان بوو بە مەرجیٚ کە حاڵی بوایەن و ئەوجا

داوەریان کردبا. لە نێو ئەو تەمتومان و تەم و مژەدا کە ئەو پێکە ڤۆدگایە لە زەین و هۆشیا دروستی کردبوو، دەم و لێوو ئەوك و خەندە درۆینەی ئەم سوسکێیە کە دیار نەبوو نێوی راستەقینەی چییە، هەندێ لە تاڵترین و شیرینترین رۆژگارەکانی ژیانی خۆی بیردەخستەوە. بۆچی بوو بە سازڤان؟ بۆچی خۆی خستە ئەم رۆژە؟ ئەمشەو ناچارە لە بەرانبەر سێ تمەندا لاسایی نەڕە نەڕی زەنگیانی ئەفریقایی و عەربدەی سورپێستانی ئەمریکایی بکاتەوە. ئایا خەڵکی هەقیان نییە کە لێی بێزار بن؟ خەڵکی لە کوێ دەزانن کە چ هێزێك گەمە بەو دەکات، کێ دەزانێ کە چ فاکتەرو هۆکارێك ئەوی وا لێکردووە؟ پازدە ساڵ لەوەبەر بوو، ئەوسا خەڵکی، داك و بابی، دۆستەکانی سەر کۆنەیان نەدەکرد، لێی وەڕەزو بێزار نەبوون، ئەوسا هەر نۆزدە ساڵ دەبوو. بەڵام لەو ساوە مەعلوم بوو کە ئەو لە ژیاندا نابێ بە بنیادەم. لە قوتابخانەدا تەمەڵ بوو، هەموو مامۆستاکان سەرزەنشتیان دەکرد. هەر هەموو هاوپۆل و هاوقوتابخانەکانی ئەو ئەمڕۆکە بوون بە بازرگان و مولکدارو کار بەدەست، بچووکترینیان بەلای کەمەوە مانگی سێ سەد تمەن مووچەی هەیە. بەڵام ئەویان لە پۆلی پێنجەمی ناوەندییەوە لە قوتابخانە دەرکرد، چونکە ئەرکە قوتابخانەییەکانی ئەنجام نەدەدا، ئەوساش، شەوانە کاتێ کە هەموو لە خەوا بوایەن، ئەو لە سەربان، لەبەر هەیڤەشەو بە ئەستێران فاڵی دەگرتەوە کە ئایا باشە لە ماڵی بابی هەڵێ یان نا. بە رۆژەوە لە جیاتی بۆ قوتابخانە بڕۆیشتبایە، تارەکەی هەڵدەگرت و دەچووە ماڵی یەك لە دۆستەکانی و تاری دەژەند. هەندێ جار شەوانە لە سەربانی دراوسێیەکیانەوە دەنگی گۆرانی کیژێك دەهات.

بەکرەی سەر گرامافۆنەکە تەواو بوو، بەکرەیەکی تری دانا، لەبەر ئەوەی نەبوو کە حەزی لەم ئاوازانە بوو، تەنیا دەیویست بیری مژول بێ، دەیویست خۆی لە جیهانی ئەو ژوورە دەربێنێ. دەیویست لە بێداریدا خەو ببینێ. سوسکێ لەو سوچەدا رۆنیشتبوو، لەوە دەچوو خەوی بێ. چەند مشتەرییەکی دیکە وەژوور کەوتن، لە دەوری سوسکێ وەستان.

... دوای ماوەیەك ئەو کیژەی ناسی. شەوێك لە کاتێکدا هەمووان نووستبوون بە سەربانی ماڵە دراوسێکەیاندا رۆیی، بە دزییەوە خۆی گەیاندە پشت دیواری ئەو ماڵەی کە دەنگی گۆرانی و ئاوازەکەی لێوە دەهات، لەگەڵ خوشکێکی لە خۆی گەورەترو پیاوێکدا کە پێدەچوو باوکیان بێ رۆنیشتبوو، دیوانی حافزی دەخوێندەوە. جار جار هەندێ شیعری بە ئاوازەوە دەخوێندەوە. کوڕە لەو ساتەوە لێبڕا کە هەر دەبێ بە تەواوەتی مۆزیقا فێر ببێ تا بتوانێ ئەم جۆرە مۆزیقایە دابهێنێ، دواتر کاتێ کە ئەو کیژە گۆرانی دەچڕی، ئەویش تاری بۆ لێدەدا، پاشان چوو بۆ هەندەران و ویڵۆن فێر بوو، دوای چەند ساڵێك خوازبێنی ئەو کیژەی کرد، ناوی سۆسەن بوو. شووی پێکرد. بوو بە ژنی. سۆسەن خشیك نەبوو، چ قەیدیە؟ ئاشقی دەنگ و ئاوازەکەی بوو بوو، لە رۆژانی یەکەمدا چەند جارێك گۆرانی بۆ چڕی... بەڵام ئەم گۆرانییە ئەو گۆرانیەی سەردەمی منداڵی نەبوو. ئەو مۆزیقایە ئیدی دووبارە نەدەبووەوە.. چەند کیژە فەرەنگی ئاشق و شەیدای مۆزیقاو جوانی ئەو بوو بوون، بەڵام ئەو هەر هەموویانی رەت کردبووەوە، تەنیا ئاشقی دەنگ و ئاوازی ئەم کیژە بوو، بەڵام ئەم کیژە کە ئێستا بوو بوو

بەژنی، ئیدی نەیدەتوانی بەو جۆرە گۆرانی بچڕێ. سۆسەنیش ئەوی خۆش نەدەویست. سۆسەن ئەشقی دەویست، بەڵام سازڤان دەنگ و ئاوازی دەویست، دەنگ و ئاوازێك كە ئەو كیژە نەی بوو. وەهم و خەیاڵ بوو، درۆ بوو، ساڵێك و پاشان چەند جار تۆریان. پاشان تەڵاق و جیا بوونەوە. ئەوجا لەو شارە رۆیی. چونكە سۆسەن ئاشنایەتی دەگەڵ پیاوێكی تردا پەیدا كردبوو. سازڤان دەیزانی بەڵام نەیدەویست بیرەنجێنێ و لەخۆی دوور بخاتەوە، بەڵكو لە پڕێكاو جارەكی دی ئەو ئاهەنگە گوم بووە بدۆزێتەوە، ئەو تەنیا دەنگ و ئاوازی ئەم كیژەی خۆش دەویست، جەستەی پێشكەش بە هەر جەستەخوازێك. ئەو شتێكی دیكەی دەویست، خەڵكی سەرزەنشتیان كرد، بێ غیرەت، نامەرد، خەڵكی ئەحمەق!

چەند نەفەرێك لە دەرەوە بانگیان كرد: "سوسكێ! سوسكێ!" بۆ دوا كەڕەت كە دەیانویست لێكدی جودا ببنەوە، سۆسەن جارێكی تری چڕی، ئەم ئاوازە ئەو ئاوازەی هەوەڵجار نەبوو، بەڵام ئەنجام كەسێك چڕی كە ئەو شەوی هاوینە لەو ماڵە بچووكەدا چڕی بووی، ئاهەنگێن منداڵانە بوو. بەڵام هەر شتێكی تیا بوو.

سازڤان، ئەو ئاوازەی یەكەمجارو ئەم ئاوازەی دوا جار كە كەمێك هاوشێوەی یەكەم بوو فەرامۆش نەكرد بوو، بەڵام هەرگیز نەیتوانی بوو، ئەوەیان دووبارە بكاتەوە... لە گوێی ئەستێڵەكە رۆنیشتبوو، سۆسەن عەباكەی بە سەریا دابوو و دەیویست بڕوات، ماوەیەكی زۆر بوو كە گۆرانی نەگوتبوو، ئەم جووتە هەرگیز ئەوەندە لێكدی نزیك نەبوو بوونەوە كە بتوانن لە قسەی یەكدی بگەن. وەكو چۆن هەموو ژن و مێردێك پێكەوەن وان، ئەو ژن و مێردانەی كە بە پارە ئاشقی یەكتر دەبن، دەربارەی ئەم جووتەش بەم جۆرە بوو: چونكە كابرای شازڤان ئەو ئاوازەی نەدۆزییەوە، ژنەكەی خۆش نەدەویست، رەنگە سۆسەنیش لەبەر ئەوەی كەسێكی دیكەی خۆش دەویست،ئەو ئاوازی زەمانی منداڵییە كە تەجەلی ئەشقی منداڵییە، دووبارە نەدەبووەوە. ئەو دوا شەوە وەك بڵێی دڵیان بە حاڵی یەكتر سوتا، بۆ دواجار ویستیان دیسان رازی دڵ هەڵڕێژن. بە نەرمە گۆرانی دەست پێكرا، ف، وێڵونەكەی دەرهێنا. ئاویان لە ئەستێڵەكە كردبوو، ئەم دەقیقەیەی دواییە وەكو مۆتەكەو كابوسێكی قورس ئەوی لە مەنگەنە دابوو، ئیدی سۆسەنی ماچ كردو گوتی: "بڕۆ!" لەو شەوەوە ئیدی لە ژنان بێزار بوو.

كابرای سازڤان لە ژێرەوە نیگایەكی سوسكێی كرد، خەندە درۆینەكانی ئەو، خۆ بادانەكانی، دەست لە كەمەرنانی ئەو، شۆخیو سوعبەتەكانی ئەو، لە روانینو لەبەر چاوی كاكی سازڤان دزێوو ناشیرین بوو. وێڕای ئەمەش ئەمشەو بەهۆی هەندێ لە ئاهەنگەكانی ئەو دوا گۆرانیەوە، نەك ئەو گۆرانیەی یەكەمجار، ئەوەی بیر هاتەوە، هاوشێوەی هەمان گۆرانی بوو كە لە گرامافۆنەكەوە دەهاتە دەرێ، یان هاوشێوەی مۆزیقایەك بوو كە لە سیمای سوسكێ، لە چاوانی پڕ ئارەزوو شەهوەتی سوسكێ، لە جەستەی رەق و تەقی سوسكێ، لە قژە رەش و زبرەكەی سوسكێ، لە سەراپای ئەم كیژە شووم و نەحسەوە دادەچۆڕا. مەودای نێوان ئەم كیژە لەگەڵ ئەو سۆسەنەدا، وەكو فاسیلەی نێوان گۆرانییەكەی دوا شەو لەگەڵ گۆرانییەكەی شەوی یەكەمدا وا بوو، بەڵام ئیدی هەرچییەك بێ جۆرە لێكچوونێكیش هەبوو.

ژنە قەڵەوەکە لەم کاتەدا بەرەو سازڤانەکە هات، دەستی خستە سەر شانی وگوتی: "ئاغا، ئاغا خراپ چاوت بڕیوەتە سوسکیّ". ئەوجا ئاماژەیەکی بۆ سوسکیّ کردو هەر سێکیانی لە دەوری پیانۆ کە کۆکردەوە. کابرای سازڤان وەك ئەوەی لە خەوێکی ترسناك بێدار بووبێتەوە دەستێکی بە قژەکەیدا هێناو لە ئاوێنەکەدا سەیرێکی سەروچاوی خۆی کرد. ژنە قەڵەوە کەتەکە گوتی: "سوسکیّ ئەمشەو دەگەڵ مسیۆدا باش کار بکە".

سوسکیّ گوتی: "ئەگەر ئەوەی چەندێك لەمە پێش شەڕی دەگەڵ کردم بیّ بە باشی کڵاّ وی دەکرێتە سەر، دەزانی کامە دەڵێم، دەموچاو خڕپن و کورتە باڵاکە".

لەم کاتەدا، لە داڵانەکەوە دەنگی هەراو زەنا بەرز بووەوە، یەکێك هاواری دەکرد: "سوسکیّ! ئەمشەو دەبیّ لە پێش هەموانەوە دەگەڵ مندا بڕەقسی". کابرایەکی کورتە باڵای ئەستوور، بەڵام گەنج، کڵاوەکەی لەسەری داکەند، پاڵتۆ جوانەکەی داکەندو بەرەو سوسکیّ غاری دا، لە دووی ئەوەوە چەند کەسێکی دی وەژوور کەوتن، یەکێکیان کە قژە رەشەکەی بەسەر هەنیەی دا بەر بوو بووەوە، بیّ سەروبەر گۆرانی دەگوت، هەندێکیان مەست بوون و لە تریان دەدا، لە دووی ئەوانەوە دوو پیرەمێرد هاتن، یەکێکیان عەینەکەکەی لەسەر ناوەندی کەپووی دانا بوو و لە ژێرییەوە تەمەشای دەکرد، لە دوای ئەوانیشەوە چەند ژنێکی دی بە عەباو بیّ عەبا هاتن. ئەوەی کە مەستی مەست بوو بەرەو سوسکیّ رۆیی، دەستێکی لە قەدی ئەو خست و گوتی: "تولە باب، ئەو شەوە هەر یەك جار لەگەڵما رەقسیت؟"

سوسکیّ گوتی: "ئاخ، کەمەرم بەردە، ئەمە لە کویّ بووی وا بە مەستی بۆ ئێرە هاتووی"؟

هەموو لە پێکەنینیان دا، کابرای سازڤان دەستی دایە وێڵونەکەی. مۆزیقا دەستی پێکرد، بیری لەوە دەکردەوە کە ئەمانە بۆچی وا شێتن. بەڵام هەر خۆی پاکانەی بۆ دەکردن. بە بۆچوونی ئەو، ئەو خەڵکانەی کە لەم ژوورەدا خڕ بوو بوونەوە، سەمایان دەکرد، پێدەکەنین، کەیفیان بە ئاوازی ناسازی وێڵونەکەی ئەو دەهات، ئەمانە کەسانێکن کە ئەگەر لە دەرێی ئەم ژوورەدا بدینرێن، لەوەیە پیاو ناچار بیّ خۆشی بووێن، لەوەیە مەجبور بیّ رێزو حورمەتیان بگریّ، لەوەیە مەجبور بیّ مەراییان بکات، بەڵام لەوەشە هەندیّ کەس رقی لێیان بێتەوە، لێیان بێزار بن، لەوەیە هەندیّ کەس بە سووك و خوێڕیان بزانن، بیانکورهێنن، هەندیّ لەوانە بەرپرسی خەڵکن. هەر یەکێك لەمانە خۆی بە ئازادو سەربەست دەزانیّ، لە کاتێکا هەر هەموو ئەمانە بورغو و سەمونەیەکی بچووکن لە کارخانەیەکی گەورەدا، هەر یەکێك لەمانە هێزێکی تایبەتی بۆ ئێرەی بکێش کردووە. کابرای سازڤان لەبەر خۆوە بیری دەکردەوە: کیّ دەزانیّ کە چ هێزێك یان چ هێزەلێك منی کێشاوەتە ئێرە؟... لە نیوە شەو بەدواوە دووکەڵ سەراپای ژوورەکەی تەنی بوو. بۆنی مەشروبو بادە پیاوی هێڕ دەکرد. سوسکیّ بە باڵا بەرزو ناو قەدی بەستراویەوە، وەکو ماسی لە نێو ئەم حەشاماتەدا مەلەی دەکرد. جەستەیان لەسەر هەمان نەزمی ئاهەنگ ساز بە یەکتر دەکەوت.

جوڵەی تێکڕای حەشاماتەکە وەکو جوڵەو بزاوتی مەکینەی قیتار بە هەمان جۆش و خرۆش، بە هەمان هەڵچوون و بە هەمان گوشارەوە بەرەو یەك لا بوو. هەموو بە یەك ئاهەنگ دەجوڵان،

زۆریان گۆنایان نابوو بە گۆنای یەکترەوە، بۆنی ئارەقەی لەشی ژنەکان کەپووی کابرای سازڤانی دەزوراندەوە، هەموو پیاوەکان چاویان لەسەر سوسکێ بوو، سوسکێ لەوساوە کە مەست بوو بوو، جار جارێ دەهاتە لای سازڤانەکەوە، پێی پێدەکەنی، شۆخی دەگەڵ دەکرد، هەندێ جار بە ئانقەست و حەمدی خۆی پێدا دەداو پاشان عوزرخوایی دەکرد یا نەیدەکرد.

کابرای سازڤان لە بەینی ئاهەنگە شادەکانەوە نەعرەتەی دەکێشا، بەڵام کێ گوێی دەگرت. کەپوی پلی دەدا، دڵی دەسوتا. بەڵام هیچ شوێنەوارێك بە سیمای وشك و مردوویەوە نەدەبینرا. ئەوانەی کە لە دنیادا زۆریان رەنج کێشاوە، دەمامکیان کردووە، ئەوانەی کە زۆر دەگرین و بە هەمان ئەندازە زۆر دەناڵێنن، هەر نازانن دەردو ئازار چیە. لە دوا سەعاتەکانی شەودا دوکەلێکی رەشی تاریك و چڕ، بە ئاسمانی ژوورەکەوە، بە نەرمی شەپۆلی دەدا. حەشاماتەکە کەمتر بوو بووەوە، بەڵام ئەوانەی کە لەوێ مابوونەوە هەموویان مەست بوون و خاوتر و داهێزراوتر بوو بوون، ئاهەنگی مۆزیقاکەو ئاهەنگی سەماکەش ئارامترو نەرمتر بوو بوو. نەوای وشك و برینگی سازەکە وەکو میاوە میاوی پشیلە لە شەوانی بەهارا، تێکەڵ بە هەراو هەنگامەی ئاپۆڕەکە دەبوو، هەندێ جار ژنێك و پیاوێك کە تەواو مەست بوو بوون، قاقا پێدەکەنین. دەنگی پێکادانی پەرداخان و هەندێ جار دەنگی شکانیان، زیاتر خەڵکەکەیان دێنایە پێکەنین. خەڵکەکە شەکەت بوو بوون، بەڵام سازڤانەکە بە پێچەوانەوە تازە کەوتبووە هەوای خۆی و گەرم بوو بوو، چاوە درشتەکانی نوقاند بوو و بە دەم و چاوە وشکەکەیەوە کە وەك کەللە سەری مردوو دەچوو، بەبێ ئیختیار کەمانەکەی بەسەر ژێو تەلی وێڵونەکەدا دێنا.. لە پڕێکا هەموو ئاپۆراکە لەبەر چاوی نەما، وایدەزانی کە ئەم ئاهەنگە زبرانەی کە خەڵکەکەی دەخستە پێکەنین لەو سەندوقە ئاسنینەوە دەردەهاتن. بەڵێ. ئەم ئەداو ئەتوارانە، ئەم نەعرەتە شوومانە هی ئەو نەبوو. گرامافۆنیان لێدەدا، بوکەڵەکەش بە تەنورەی هەڵکشاوەوە، بەڕانی رووتەوە بە سەریەوە چەرخەڵەی لێدەدا. خێراتر، خێراتر، دەی، دەی سوسکێ بە تەنێ لەگەڵ نەفەرێکی دیکەدا لە ناوەندی ژوورەکەدا سوڕی دەدا، خێراتر، خێراتر، حەشاماتەکە دووبارە کەوتەوە جم و جوڵ. سازڤانەکەش تا دەیتوانی کەمانەکەی توندتر و بە جۆرێ بە ژێ یان تەلی وێڵۆنەکەدا دێنا، کەمووی لەشی بنیادەمی هوشیار گرژ دەبوون.

حەشاماتەکە پێدەکەنێ، کەیفی دەکرد، چ سازڤانێکی باشیان هێناوە. بەڵام لەبەر چاوی سازڤانەکە هەر هەموو ئەم هەراو هوریایە مەحو بوو بوو، بوکەڵەکە گەورەتر بوو، چووە کڵێشەو قیافەتی سوسکێوە، سوسکێ بۆ بە تەنێ دەڕەقسی؟ مەگەر ئێستا دەستی لە ملی ئەو پیاوە ئەستوورە کورتە باڵا دەموچاو هەڵکفاوە نەکردبوو؟ مەگەر لەشی بەسەر دەستی ئەودا نەدابوو وەکو مەل بە حەواوە نەبوو؟ نووکە (سوسکێ)ش تەواو بوو. دووکەڵی جگەرە بوو بە پەڵە هەورێکی سپی و دەیویست هەیڤەشەو داپۆشێت، بەڵام نەرمە بایەکی خۆش رەواندیەوە. لە دوورەوە لە سەربانی دراوسێکەیاندا دەنگی ئاوازێکی سۆزناك دەهات، ئاوازێکی سامناك. هەمدیس سوسکێ، هەمدیس ئەو دەموچاوە هەڵکفاوە شەهوانیەی پیاوەی کورتە باڵا..

هەمدیس بوکەڵەکە... هەمدیس ویڵونەکەی ئەو.. دیسانەوە خەندەو قاقاو دەنگی رشانەوەی ئەوانەی کە تاك تاك دەچوونە دەرێ، دیسان پۆخڵەوات و دیسان نەگبەتی.. بەڵام بۆ کابرای سازژەن دیسانەوە نەعرەتەو هاوارو دیسان دەردو ئازار لە هەمان ژووردا، لە هەمان ژووردا هەموو سەماکەرەکان کەشەنگ بوو بوون، هەموو چاوەنواڕ بوون کە ئەگەر بۆ دەقیقەیەکیش بووە، مۆزیقا بوەستێ، بەڵام سازژەنەکە جارەکی تر خۆی لەبیر کردبوو، جاریکی تر لە بیری چوو بوو کە سبەینێش هەر زندووە، جارەکی تر ئەوانەی لە بیر کردبوو کە هیچ کاتێ لە بیری ئەودانین. نیگایەکی حەشاماتەکەو لە ژێرەوە نیگایەکی سوسکێی کرد، ئەو، ئەم قژە، ئەم گەڕووە دەناسێت، بەڵام سوسکێ لەکوێ و سۆسەن لە کوێ؟ بۆ نە ء، فەرقی ئەم دووانە وەکو فەرقی ئاوازێن ویڵونەکەی ئەوو مۆزیقایەکی راستەقینە وایە. بۆ نەء، پەیوەندییەك هەس. چاوەکانی کەوتنە رێشکەوپێشکە. دیسان چەند پێکە کۆنیاکێکی یەك لە دوای یەکی هەڵدا. ژوورەکە لەبەر چاوی تاریك بوو. دیسانەوە هەمان شەوی قەراخ ئەستێلەکە، ئەمجارەیان سۆسەن خۆی بوو. هەنگێ ئەو ئاوازە سامناکە، ئەو شیعرەی کە هەزار جار لە خەوو بێداریدا بیستبووی، لە یاد چوو بوو!.

سستیەکی سەیر باڵی بەسەراکێشا، قامکەکانی دەستی رچین وچایین. دەتگوت خەریکە ئەو ئاهەنگ و ئاوازانەی وەبیر بێتەوە. جارێکی دی گەنج بووەوە، دەتگوت خەریکە گیانی دەکێشن.

حەشاماتە ماندووەکە وایان زانی کە کابرای سازژەن کەشەنگ بووە. دەیانەوێ پشوویەك بدەن. سوسکێ پێدەکەنی بەڵام خۆیا بوو کە بە درۆوە پێدەکەنی. بە دەنگی بەرز قسەی دەکرد. دەیویست خۆی مژوڵ بکات. بەڵام لە ناخدا وەزع و حاڵی سازژەنەکە کاری لەویش کردبوو. دەنگی دەلەرزی، پیانۆژەنەکە بە دەستەسڕ ئارەقەکەی نێو چەوانی دەسڕی. (سوسکێ)ش پەرداخێ کۆکتی خواردەوە. هەر هەموو ئەمانە چەند ساتێکی نەبرد. کابرای سازژەن دووبارە دەستی پێکردەوە. لە پڕێکا چەند نەفەرێك بەسەر (سوسکێ)دا دارژان، ئەویش یەکێکی هەڵبژارد کە لە هەموویان ناشیرینتر، و پیرتر بوو، بۆچی ئەوانی دی سەریان سوڕدەمێنێ؟ ئەمە ئاهەنگی رەقسین نییە، کابرا تۆ شێت بووی!... قەل پیاو بەم ئاهەنگە رەقس ناکرێ. ئەو پیرەمێرە رەزا قورسەی کە دەیویست دەگەڵ سوسکێ دا برەقسێ لە هەموویان پتر توڕە بوو. لەهجەیەکی تورکی هەبوو، مقۆ مقۆیەك کەوتە ناو حەشاماتەکە.. یەکێك هاواری کرد: "کابرا گریەو ناڵەکەت هەڵگرە بۆ ماڵی دایکت!" ژنە قەڵەوەکە لە پشت مێزەکەی هاتە دەرێ، بە زەحمەت بە نێو ئاپۆراکەدا رەت بوو. هاتە لای سازژەنەکەو گوتی: "ئاغا، ئاغا ئەم ئاهەنگە باش نییە" بە فارسی گوتی تا خەڵکەکە تێ بگەن. پاشان هەمان قسەی بە فەرەنسی دووبارە کردەوە، بەڵام ئەو نە دەیبینی، نەدەیبیست، ئەو لەم ساتەدا ئەم ژیانەی لە دەست دابوو. چاوەکانی نوقاند بوو، بێ ئەوەی هیچ شوێنەوارێك ببینرێ، هەمان دەمامکی بێ گیان و مردوو بەروویەوە بوو، ژنەکە دەیویست ویڵۆنەکەی لە دەست بسەنێ. بەڵام سوسکێ کە تا

ئێستا لە زەرق ئەم چەند دەقەقەیەدا وەکو مردوو وشك بوو بوو، بەرەو لای ژنە قەڵەوە کەتەکە ڕۆیی،دەستی گرت و گوتی: "سەبرکە، سەبرکە!".
هەموو کڕ بوون، لە جێی خۆ دانیشتن، ئیدی نۆرەی سوسکیٚ بوو.. پیرەمێردە تورکەکە سوسکێی ئارام کردەوە، دەموچاوو لێوی راموسی. سوسکیٚ لە ناوەندی ژوورەکەدا وەستا بوو، هەموو ئەوانەی، کە هێشتا قسەیان دەکرد یان بەپێوە وەستا بوون، بێدەنگ کردو بە هەر یەکەیان وەعدو بەڵێنێکی دا. ورتە لە کەسەوە نەدەهات، ئێستا ئیدی کابرای سازڤان چاوانی کردەوە، خۆی دەگەڵ سۆسەن دا، نەك لەگەڵ سوسکیٚ دا، بە تەنیٚ بینی. ئەمە خودی سۆسەن بوو، هەمان ئەو کیژەیە کە لە سەربان گۆرانی دەگوت، بەڵام ئەو ئاوازەی نەدەهاتەوە بیر. ئەمە هەمان ئەو ژنەیە کە لە گوێی ئەستێلەکە ئەو ئاوازو گۆرانیانەی گوت و ئەوی فێر کرد کە... بە ئەسپایی بەرەو پیری چوو. سۆسەن دەترساو پاشەو پاش دەکشایەوە، ئەوسا کەمانەکەی بە ژێیەکاندا هێنا، ئاوازەکەی دوا شەوی بیرهاتەوە، ئەم ئاوازە روح و گیانی زەمانی لاوی ئەو بوو، بەڵام ئەو ئاوازەی زەمانی منداڵی ئیدی دووبارە نەبووەوە، بەڵام گریە بوو، سۆسەن دەلەرزی، دەکشایەوە، دەستی خستە سەر سوچی مێزی کەناری ژوورەکە، لەشی بردە دواوە، هەموو حەشاماتەکە بە واقی وڕەوە تەمەشای ئەم دووەیان دەکرد، چ سیناریۆیەکیان ساز کردبوو، هیچ نمایشێك لەمە جوانتر نەدەبوو، بەڵام بێهودە، ئەوانە تازە دەیانویست سوسکیٚ لاس بدەن، گریەی وێڵۆنەکە توندتر دەبوو، داخی بۆ ژیانی بە هەدەر چووی خۆی دەخوارد، دەیویست تۆڵە لەو سۆنگەو فاکتەرانە بکاتەوە کە ئەویان خستووەتە ئەم رۆژگارە، هەنگیٚ سۆسەن خوێندی، گۆرانی چڕی، هەمان ئەو شیعرەی چڕی کە لە شەوی یەکەمدا چڕی بووی، بەڵام بەو ئاهەنگەی کە لە دوا شەودا چڕی بووی، بە هەمان جۆر کە لە گوێی ئەستێڵەکە، کاتیٚ کە ئاوەکە نەرم نەرم شوڕە شوڕی دەکرد، خوێندبووی:

مجو درستی عهد از جهان سست نهاد

که این عجوزه عروس هزار داماداست.

وشەی "دامادا ست" بەو کێش و هەیبەتەیەوە تەواو نەبوو بوو کە زایەڵەی دەنگی دایەوە، لە هەیبەتی نێوە دێڕی دواییدا، ئەوانەی کە مەست بوون، بەدمەست بوون، هەندێك لە ژوورەکە وەدەر کەوتن، زۆربەیان لە ترسا دانیشتن، بەڵام سۆسەن لە پڕ لە جێی خۆی راپەڕی، وێڵۆنەکەی لە دەستی کابرای سازڤان وەرگرت و کێشای بە زەویداو تەق، تەلەکانی لێك پچڕان.
هەرکە وێڵۆنەکە کەوتە سەر زەوی سازڤانەکەش هاواری کرد، لە نەعرەتەی دا، نەعرەتەی کێشا وەك چۆن حەیوانانی کوڤی و هۆڤی پێکراو نەعرەتە دەکێشن، هەموو ترسان، ژنەکان پاڵتۆکانیان لەبەر کرد. "سوسکیٚ"ش لە ژوورەکە وەدەرکەوت.
حەشاماتەکە یەك یەك بەلای سازڤانەکەدا رەت بوون، ئەو نیگای روو بە زەوی بڕی بووە وێڵۆنەکە، دەستەکانی ئاوێزان بوون، چاوەکانی کراوەو بیٚ گیان میناکی چاوانی لەیستۆکی

گەچین بوون، سەراپا وەکو پەیکەرێك لەوێدا رەق راوەستا بوو، تەنیا پیانۆژەنەکە دڵی پێ سوتا، ویستی دای بنیشێنێ، لێ سازڤانەکە دایە دواوە.

لە دەرەوە سەدای "سوسکێ! سوسکێ!" دەهات، هەمووان جگە لە پیانۆ ژەنەکە لە ژوورەکە وەدەر کەوتبوون. لە دالآنەکەوە دەنگی ژنە قەڵەوەکە دەهات کە لەسەر پارە دەگەڵ مشتەریەکاندا شەڕی بوو.

سازڤانەکە وەك ئەوەی پشتی شکابێ، بە ئەسپایی دانەوییەوە، وێڵۆنەکەی لە عاردی هەڵگرتەوە، تەلە پچڕاوەکانی پێوە ئاوێزان بوو، وەکو لاوێکی تازە ئاشق کە دەست بە بسکانی یارەکەیدا بێنێ، دەستێکی بە تەلەکاندا هێنا، نەوازشی کردن، ئەم تەلانە لە جیاتی تان و پۆی گیانی ئەو بوون، بەڵام هێشتا تەلێکی پێوە مابوو، یەك تەل، ئەم ئاهەنگەی کە لەیادی چوو بوو نابێ جارێکی دی لە یادی بچێ. ئەم ئاهەنگە، میناکی ئەو ئاهەنگەی شەوی یەکەم بوو، ئەو ئاهەنگەی شەوی یەکەم، عومرێکی تەواو بەوی رابوارد بوو، رەنگە هیچ ئاهەنگێك لە گۆڕێ نەبووبێ، هێزێکی نادیارو ئەفسوناوی بووبێ، کە جەستەو گیانی ئەوی لە ژێر گورزێن مەحکەمدا دەکوتا، هەر چیەك بوو، ئیدی نابێ ئەو بەرگەو بەڵگەیەی لە یاد بچێ. یەك عومری بە هەدەر چوو بوو، دەبێ ئیدی تۆڵەی بکاتەوەە... بەم ئاهەنگە دیرینگ.. دیرینگ.. بووك... زاوا... دنگ.

سێ تەلی پچڕا بوو، ئەویش دایە لای بێعاریو لە دوا تەلی دا

تهران- ٨ شەهریوەر ١٣١١- (١٩٣٢).

# سەربازی قوڕقوشمین

چوار پێنج دانە ساڵە کە من بەلای کەمەوە رۆژی چوار جاران سواری ئەم پاسانەی هێڵی مەیدانی سوپا– شاهپور دەبم. سەیر ئەمەیە کە من لە نێو ئەم پاسانەدا پتر لەوەی لە زەرق هەشت ساڵی قوتابخانەی سەرەتایی و دوو ساڵی قوتابخانەی ناوەندی دا فێری بووم، شت حاڵی بووم. ئەم شتەش زۆر سەیر نیە، چونکە من لە رەگەوە منالێکی کەودەن و شەرمنۆك بووم، هەر کاتێ دوو سێ جار لە بابەتێك تێ نەدەگەییشتم و لە مامۆستاکەمانم – خوا عافوی بکات– دەپرسی، دەیگوت: "هەندێ کەس قەت تێناگەن". بەڵام لەم پاسانەدا شتێکی گرینگم بۆ دەرکەوت. هەندێ جار کە پاسەکان هێشتا بە تەواوەتی پڕ نەدەبوون و بە ناچاری و لەبەر بێتاقەتی نەفەرەکان تا نزیکی چوار ریانی حەسەن ئاوا دەڕۆیی، لەم حاڵەتەدا شاگردی شۆفێرەکە هەڵبەتە بە تەواوەتی ئاگای لەوە بوو کە لە کوێدا نەفەرێك دەیەوێ سوار بێ، ئەگەر بە رێکەوت نەیدیتبا، شوفێرەکە دەیگوت: "حەواست لە کوێیە" یاڵلا ئەو دە شاهییە سەربخە." یان "ئەو دە شاهیە هەڵگرە". بە هەر حاڵ ئەم "دەشاهییە" فرە دووبارە دەبووەوەو هەڵبەتە مەبەست لە "دە شاهی" نەفەر بوو. هەر نەفەرێك بەلای شوفێرەکەوە بایی دە شاهی بوو، دە شاهی دێنا، جا ئیدی ئەگەر ئەم نەفەرە حاجی عەلی ئاغای چێوار بوایە کە پتر لە سەد هەزار تمەن سەروەت و سامانی هەبوو، یان سەرۆکی دایەرەی ئاژەڵان بوایە کە هەشت سەد تمەن سەر قفڵی دابوو و جگە لە دوو سێ هەزار تمەن خێرو قازانج مانگی چوار سەد تمەن مووچەی هەبوو، یان خودی من چ ئەو رۆژەی کە معاشم وەردەگرت و نزیکەی حەوت سەد دە شاهیم پێ دەبوو، بەهای من بۆ ئەوو لەلای ئەو هەمان دە شاهی بوو، و چ رۆژی پێش مووچەش کە دوای دانی پارەی پلیت، بەڕکم وەکو دڵی ئیماندار پاك دەبووەوە، قیمەت و بەهای من بۆ ئەو فەرقی نەدەکرد، رۆژێك لە یەکێك لەم پاسانەدا ژنۆکەیەك دانیشتبوو و سەربازێکی قوڕقوشمینی لە قەراخ پەنجەرەی پاسەکە دانا بوو، هەندێ جار ئەم سەربازەی دەردێنا، دەیکرد بە دەمیاو پاشان لە جێیەکەی خۆی دایدەنایەوە، هەر کە ئەم لەیستۆکە بە هۆی تەکانی پاسەکەوە وەردەگەڕا، خێرا هەڵیدەگرتەوەو دەیکرد بە دەمیا، من ماوەیەك غەرقی تەمەشای ئەم کارەی ئەو بووم، کە ئاوڕی پشتەوەم دایەوە، سەیرم کرد "ف" دانیشتووەو چاك و خۆشی لەگەڵ کردم. من لە ئەنجامی هاتوچۆ بۆ باشوور ئاشنای بوو بووم، پاشان کە لە پاسەکە دابەزیم، بیرم کەوتەوە کە ئەم ئاشنایەی من لەم سەربازە قورقوشمینانە دروست دەکات و بە موغازەکانی دەفرۆشێت.. ماوەیەك بوری و "ف"م نەدیتەوە، چونکە لەو ماوەیەدا من ئەندامی دایەرەی کۆنترۆڵی تلیاك بووم و بە ماموری ناردیانم بۆ شارۆچکەی فەساو لەوێ نەخۆش کەوتم و گەڕامەوە و ماوەیەك بێکار بووم. کە لە سەفەر گەڕامەوە دوای نزیکەی دوو ساڵ چووم بۆ دیدەنی ف. هۆی چوونەکەم ئەمە بوو کە یەکێك لە کاربەدەستانی دارایی فەسا ئەوی دەناسی و بە منا بڕێك تلیاکی بۆ نارد بوو.

هاوڕێکەم هەندێ غەریب هاتە بەرچاوم، ژووری کارەکەی کە جاران پڕ بوو لە مەنجەڵ و تەبەقە قورقوشمو رەژوو و تاوەو هەنبانە، و لە هەمان کاتدا ڕێك و پێك بوو، ئەمڕۆ پەرش و بڵاو دەینواند. مەقەڵی پێکردو پێکەوە لەحەوشەدا قالیچەمان راخستو لێی دانیشتین. باس هاتە سەر ژنەی گۆڕین. پاشا چیرۆك و سەربوری خۆی بۆ گێڕامەوە، هەوەڵجار بەبێ تاقەتی، پاشان کە سەیری کرد من هیچ مەبەستێکم نییە، خۆی زیاتر پەلەی بوو، بەڵام بەبێ سەروبەری. زۆربەی بە جۆرێ بوو کە من سەرم لێی دەرنەدەکردو نەمدەتوانی تێی بگەم. ئاخیریش پاشماوەکەی تەواو نەکردو من لەم لاو لەو لاوە زانیم کە تێك چووە، بەڵام هەر هۆی راستەقینەی شێتییەکەیم بە دروستی نەزانی.

*                    *                    *

"من دەبێ جارێ هەموو سەربورەکەی خۆم وەبیر خۆم بێنمەوە، پاشان بۆ تۆی بگێڕمەوە. سەربوری چی؟ خۆیشم نازانم لە کوێوە بیگێڕمەوە. لەو رۆژەوە کە هاتوومە دنیایە؟ لەو رۆژەوە کە دەستی چەپ و راستی خۆم لێکدی هەڵاوێردووە. ژیانی خانەوادەیی خۆم؟ بابم چتۆ بەشەرێ بووە؟ چەندم دایکم خۆش ویستوە؟ نە ء حەواس و حەوسەڵەم نییە".

قسە کردنی خەڵکانی تلیاکی جۆرێکی تایبەتیە، سەری رستەیەك دادەمەزرێنن‌و تۆزێ تلیاك بەسەری سەبیلەکەیانەوە دەنەن تا ئەو تلیاکە تەواو نەبێ، رستەکەشیان تەواو نابێ، جا گوێدێر دەبێ سەبرو حەوسەلەی هەبێ و لە جزەجزی تلیاکەکە بێزار نەبێ. ئەوەی کە قسەو گفت و لفتی ئەم تلیاکیانە خۆش دەکات، تۆنی شیرین و نەرمی دەنگیانە.

"لە بیرتە کە ئێمە لە چ جەهەنەمێکا بوو کە یەکترمان ناسی؟ لە ڕێگەی باشوور بوو، نازانم رەنگە لە کازرون بووبێ، من پاش ئەوەی لە تۆ هەڵبڕام – بەڵێ وا دەبێ بە پێنج ساڵ– چووم بۆ بوشەهر، چووم کە هەیڤەك لەوێ بمنێنەوە. بە ماموریەتێکی بچووك چووم، کەچی لە بری مانگێك یەك دانە ساڵم پێ چوو. لە دایەرەش دەریانکردم، چونکە پێیان گوتم: وەرە بۆ تاران، نەهاتم، لەوێندەر مامەوە... تاقەتت دەچێت، تۆ گەرەکتە بزانی کە پەیوەندی من بەو ژنەوە کە ئەو رۆژە لە پاسەکەدا دیتت و ئەو لەیستۆکەی بە دەستیەوە بوو چییە. تۆزێ سەبرت بێ، تۆ دەبێ ئەوە بزانی کە ژیانی من لە هەوەڵەوە، لەو کاتەوە کە لە باوکم جیا بوومەوە، لە سنووری ئەم وردە شتانەی کە لە دەوروبەرت دەیبینی، تێ نەپەریوە، زۆر رۆژان هەبووە کە من فراڤین و شیڤم نەخواردووە. چونکە ئەگەر شتێکم بووبێ‌و فرۆشتبم،ئەویشم بەتلیاك داوە. هۆی هەموو ئەم ژیانەی من بابم بووە، رەنگە واش نەبێ، دەنا بۆچی من نەبووم بە بەشەر، وا نییە؟ تۆ حەز لە چارەی من ناکەی چونکە تلیاك دەکێشم. هەقیشتە، بەڵام دەزانی کە خۆیشم لەخۆم بێزارم. نازانی، دە تەمەشا! سەیری پشتی دەستم بکە، تەماشای یەخەی کراسەکەم بکە! رەنگە دوو هەفتە ببێ کە ئاوم بە دەموچاوما نەداوە. گریمان... تازە بە چی دەچێت، خۆ من هەمیشە تلیاکی نەبووم، هەمیشە بەمجۆرە نەبووم... خۆ من بەو شێوەیە نەخوڵقاوم. ئەوسا کە لە بوشەهر بووم، تلیاکم نەدەکێشا، پاشان بووم بە تلیاکی. ئەوساکە تازە دایکم مردبوو. کەبیرم

دەكەوێتەوە تەزووم بەلەشدا دێت، ئەویش منی خۆش گەرەك بوو، من شانزە ساڵان بووم، كەچی تا دایكم دەستی نەخستبایە ناو دەستم خەو نەدەچووە چاوم. ئەمانە شتەلێك نین كە هەموو كەسێك تێی بگات. لە بوشەهر... بەڵێ، لە بوشەهر لە ماڵی سەرۆكی دایەرەكەم، داماوە ئێستا بە تۆمەتی قاچاخچێتی تلیاكەوە حەپسە، ژوورێكم هەبوو. هۆیەكەشی ئەمە بوو كە فشە دەنگێكم پێوە بوو، چونكە لای بابم فێری خوێندنەوەی قورئان بوو بووم، ئەو سەرۆك دایەرەیەش ئەهلی زەوق بوو، هەموو شەوێ منداڵ و مەرزمی كۆ دەكردەوە، خوانی عەرەق و شەراب ساز دەبوو و بەزم و ئاهەنگمان دەردەچوو. هەڵبەتە دەبێ ئەوەشت پێ بێژم كە من تا ئەو كاتە عەرەقم نەخواردبووەوە. یانی رێك و رەوان هیچ فیعل و ئەفعال و تەڵەكەبازییەكم نەكردبوو.. هیچ دارو دەستەیەك منی بە یەكێك لە خۆی حەساو نەدەكرد. جگە لەمەی كە من منداڵە ئاخوند بووم، هەمیشەش خەمین و مەلول بووم و دەستم نەدەگەییە هیچ كوێیەك. گەورەترین لەزەتی من لە ژیانا ئەمە بوو كە بەلای دایكمەوە دانیشم، دەستە نەرمەكانی لە نێو دەستم بنەم و دڵخۆشی بدەمەوە.
شەوێك عەرەقی زۆریان دامێ، تێك چووم، رشامەوە، هیچ شتێكی ئەم شەوەم لە بیر نییە. بەیانی تەماشام كرد كەوكەب لە ژوورەكە دانیشتووەو تەشت و مەسینەی هێناوەو دەیەوێ ئەو مافورەی كە شەوێ بەسەریا رشابوومەوە بشوات، كەوكەب روبەندی بەرووەوە نەبوو و دەمتوانی بیدینم. لێوەكانی سوورو ئاڵ بوون، پەرچەمەكەی كەوتبووە سەر هەنیەی و دەموچاوی خڕوخڕپن بوو. پاشان زانیم كە باوكە ئەم كەوكەبەی بەدایەنی لە شیرازەوە هێنا بوو، بۆ ماوەی ساڵێك، شەرتی ساڵێكی لەگەڵ كردبوون، بەڵام چونكە كارەكەرێكی باش دەرچوو بوو، هەر چەند ساڵەكەی تەواو بوو بوو، واتە شەرتی هەڵهاتبوو، دەیانویست لە لای خۆیان بیهێڵنەوە. بە خۆی ئەم شتانەی بۆ من دەگێڕایەوە "من لە ماوەی ئەم ساڵەدا شارەزای چاكەو خراپەیان بووم، نامەوێ چیتر لێرە وەمێنم: باوكە زۆر باشە، كەسیان عەیبیان نییە، منداڵەكەشیانم خۆش گەرەكە، ئەمانە هەمووی بە جێی خۆی، من دەمەوێ بڕۆم و شوو بكەم، دەمەوێ بڕۆم بۆ شیراز، دەمەوێ بڕۆم شوو بكەم، دەمەوێ بچمەوە لای مێردی یەكەمم، سەرباز وەزیفە بوو، سەربازیەكەی تەواو بووە، یەك تەلاقەی داوم و دەتوانم بچەوەلای. من دەڕۆم، خۆ كۆیلەی زێڕكڕیان نیم". كەوكەب قسەكەی خۆی بردە سەر. لە بیرم چوو ئەمەش بڵێم، كەوكەب كاتێ كە دەردە دڵەكانی بە من گوت، وەڵامم دایەوە: "هەقی خۆتە، من لە جیاتی بابە بوایەم، بەڕێم دەكردیت". كەوكەب قسەی خۆی بردە سەر. شەوێك كە بۆ ماڵ چوومەوە، سەیرم كرد كەوكەب لە ماڵەكەی منە. هاتبوو تا من بۆ شیرازی رەوانە بكەم.
"سەربوری راستەقینەی من دەگەڵ كەوكەبدا لێرەوە دەست پێدەكات".بازنە سپی واژو پاشان شینباوەكانی دووكەڵی تلیاكەكە حاڵەتێكی فەلسەفیانەی بە قسەكانی ئەو دەدا. "هەر كە ئەم ژنە هاتە ناو ژینی منەوە، وەزعو حاڵی منی شێواند، ئەگەر بڵێی بچووكترین هەواو هەوەس و ئارەزوویەك لە نێوان من و ئەم ژنەدا نەبوو. من كەوكەبم خۆش دەویست، خۆشم دەویست وەكو چۆن بنیادەم دایكی خۆی خۆش گەرەكە، بەڵام هیچ پەیوەندییەك لە بەینمانا نەبوو، ئەو

عـەزاب و مەینەتیانـەی مـن لـە ژیانـا کێشـاومە، ئـەو بـەڵاو نەهامەتیانـەی کـە راسـتەوخۆو ناڕاستەوخۆ بە دەستی کەوکەب بەسەرم هاتوون، هەر هەموو ئەمانە بۆ من حەتمی بوون، من بەم ژینە مەحکوم بووم. هەر لە رۆژی یەکەمەوە کە هاتمە دنیاو ژیانەوە، نەشونماو پەروەردەی من لە ژێـر دەسـتی ئـەو باوکـەو لـەداوینی ئـەو دایکـەدا، هـەر هـەموو ئەمانـە وایـان لێکـردم کـە ئەمجۆرە رەوت و رێبازە لـە ژیانـدا هەڵبـژێرم. هـەموو ئەوانـە هـۆو سۆنگەی خـۆی هـەبوو. منـی داماو، منی بەلەنگاز گەمەی دەستان بووم. خۆزیا لەبری ئەوەی کە دەڵێم "دەمەویٚ" دەمتوانی بلـێم "دەیانـەوێم" کۆکـە کـۆکی لـە پەسـتاو بـیٚ برانـەوە قسـەکەیان پـیٚ بـڕی. دوای چـەند دەقەیەك، لە نویٚ دەستی بە قسان کردەوە: "لە بابەتەکە دوور کەوتمەوە. شەوێك کەوکـەب لـە ماڵی من بوو، هاتبوو گوایە بەیانی سەفەر بکات، قەرار بوو من بەیانی ئوتۆمبیلی بۆ بگرم و بۆ شیرازی رەوان بکـەم. مـن تاقـە ژوورێکـم هـەبوو، گلێمـێکم کـڕی بـوو و لـە ناویـا رام خسـتبوو. نیوەی ژوورەکە راخرا بوو. کەوکەب بەرو بوخچەکەی خـۆی کـردەوە، لـە عاردەکـەی راخسـت و خەوت. بەیانی زوو چووم بۆ تاقیبی ئوتۆمبیل و لەگەڵی رێك کەوتم و هەموو قـەول و قـەرارێکم لەگەڵیا بڕییەوە. نیوەڕۆ کە هاتمەوە ماڵیٚ سەیرم کرد کەوکـەب نـەماوە. قـەول و قـەرارم دەگـەڵ گەراجداردا کردبوو کـە لای عەسـر دەکەوێتـە ریٚ. ماوەیـەك چاوەڕوانم کـردو لـە کـار بـووم. بـۆ دایەرە نەچووم، دەمەو خۆراوا بوو سەیرم کرد کەوکەب گەڕاوەتەوەو پەست و بـیٚ گێولـە: "من لـە بەیانیـەوە تائێسـتا بـە دوای تـۆدا دەگـەڕام. دویٚ شـەو کـە بەپەلـە سـیپاڵەکانم خـڕ کـردەوە، شتێکم لە بیر کرد. ئەگـەر نەیدۆزمـەوە، بێگومـان لـە رێگـەدا بەڵایـەکم بەسـەرا دێـت". لـەجیاتی وەڵام، پێڵاوەکانم لە پیٚ کردو بە دووی کارا رۆیشتم. درەنگە شەوانیٚ بۆ ماڵ هاتمەوە،سەیرم کرد کەوکەب لەسەر بوخچەکەی دانیشتووەو خەریکە شتەکانی دەگـەڕیٚ. لـێم پرسـی: "چیت ون کردووە؟" دیتم بە دەم هەنسکی گریانەوە: "لەیستۆکێك".

– لەیستۆکی چی؟

– سەربازێکی قورقوشمینە.

بەسەرسامی گوتم: "سەربازێکی قورقوشمین بایی دە شاهیە، ئیدی ئەم هەموو گریـەو زارییـەی نەگەرەکە". وەك بلێی لـە قسـەکەی مـن حـاڵی نـەبوو، پێـی گـوتم: "دەشـاهی! بـۆ مـن لـە گیـان و روحم بەنرختر بوو.

کەوکـەب ئـەم سـەربازە قورقوشمینـەی لـە مـاڵی بـابی مناڵەکـە بـە دەسـت هێنـا بـوو. رۆژێـك منداڵەکـەی بـۆ گـەڕان بردبـوو، لـە دوکـانێکی عـەتاری ئـەم سـەربازەی کـڕی بـوو. بـەڵام چـونکە سەربازەکە دەستی منداڵەکەی بڕی بوو، ئیـدی خـانم نـەی هێشـتبوو کـە چیتر بیداتـە دەسـتی منداڵەکەوە. لەبەر ئەمە کەوکەب لە خانم رەنجا بوو و ئیتر نەی ویستبوو، لەویٚ بمێنێتەوە. لەو ساوە تا ئێستا ئەو سەربازەی لای خۆی هەڵگرتبوو و ئێستا خەمی لێهـاتبوو، ئـەم گـوم بـوونی سەربازەی بە نیشانەی بەڵاو خراپ دەزانی.

دوای چـەند رۆژێـك کـە لـە مـاڵی مـن بـوو، رۆژیٚ پێـی گـوتم: "دەزانـی. مـن نیگـەران و دڵتـەنگم. نامەویٚ بۆ شیراز بڕۆمەوە، پێدەچیٚ کە مێردەکـەم لـێم تێـر بووبـیٚ و ئیـدی نەیەوێمـەوە. ئەگـەر

دەتەویٚ لیٚرە کارەکەری تۆ دەکەم دەنا دەڕۆم بۆ جیٚیەکی دیکە. من دەبیٚ تا ئەو سەربازە قورقوشمینە نەدۆزمەوە لەم شارە وەمیٚنم. دەنا لە داخا دەمرم."

"…. و کەوکەب مایەوەو نەمرد. مانگیٚك مایەوەو منی کوشت، شەوانە من دەچوومە سەربان و کەوکەب لە ژوورەکەدا دەنووست، بەیانیان چای بۆ لیٚدەنام، ناو ماڵەکەی بۆ پاك دەکردمەوەو فراڤینی بۆ لیٚدەنام. هەندیٚ جار پیٚکڤە نانمان دەخوارد، بە جۆریٚ مدارای دەکردم لە من وایە دایکمە، و بەم خەیاڵە ئاسوودە بووم، شەوان بەلای یەکەوە رۆدەنیشتین، یەك مانگی رەبەق بەمجۆرە رابورد. پاش ئەوە لە تارانەوە داوا کرام. بە کەوکەبم گوت: "من دەبیٚ بچم بۆ تاران، ئەگەر حەز دەکەی دەتبەم". گوتی: "نا، من لیٚرە دەمیٚنمەوە، دەبیٚ ئەو سەربازە بدۆزمەوە دەنا دەمرم". پاشان کەمیٚك تیٚفکری و گوتی: "تۆ کەی بۆ تاران دەڕۆیت؟"

– من رۆژی شەممە حەرەکەت دەکەم.

"ئەوسا هەستا کە بچیٚ شیڤ ئامادە بکات و گوتی: "منیش تا رۆژی شەممە شویٚنیٚ بۆ خۆم دەدۆزمەوە" گوتم: "لە ئیٚستاوە تا شەممە یا عەمر". بەلاٚم رۆژی شەممە من نەڕۆیشتم. شەممەکەی تریش هەر نەڕۆیشتم، شەممەی سیٚیەمیش هەر لەویٚ بووم. لە تارانەوە جواب هات کە بۆچی لە حەرەکەتی خۆم ئاگادارم نەکردونەتەوە. جوابەکەم دڕین. لە هەفتەی چوارەمدا موچەکەم بڕا، لە زەرفی ئەم چوار هەفتەیەدا کەوکەبیش شویٚنی بۆ خۆی پەیدا نەکردبوو. شەویٚك لیٚم پرسی: "ئەم سەربازە قوڕقوشمینەی تۆ چۆنی بوو؟ پیٚم بڵیٚ بەڵکو بتوانم یەکیٚکی وەکو خۆیت بۆ بکرم".

– بە خۆڕایی خۆت ئەزیەت مەدە. من هەموو ئەم شارە گەڕاوم، سەربازی وەکو ئەوەی من لە هیچ شویٚنیٚ دەست ناکەویٚ. بەلاٚم تۆ شەوانە یەکجار زۆر دەجوڵیٚی و گینگڵ دەدەی. دویٚ شەو هاتمە دیار جیٚگاکەت، بۆچی ئەوەندە بیٚ تاقەتی دایکتی.

"راستی دەکرد: بیرم دیٚ لە خەوما ئەفسەریٚك بە شمشیٚری رووتەوە بەرەو دایکم هیٚرشی برد، بابم لەویٚندەر وەستا بوو و فزەی نەدەکرد، بەلاٚم هی ئەوە بوو کە من ئەو رۆژانە عەرەقم زۆر دەخواردەوە."

سبەینیٚ دەگەڵ کەوکەبدا چووین تا سەربازی قوڕقوشمین بکڕین. بیٚ فایدە بوو، چونکە دەچووینە هەر جیٚیەك کەوکەب دەیگوت: نە، ئەم لەیستۆکانە هیچیان ئەو سەربازە نین.

هەنگیٚ من کەوتمە بیری ئەوەی کە بە خۆم ئەم سەربازە بە دڵی کەوکەب دروست بکەم. مۆدیٚل و قالبی دارم دروست کرد، قوڕقوشمم کڕی، ئیدی تۆ ئەم شتانەت دیووەو بە خۆت دەزانی.. ئەنجام ئەو سەربازەی دڵخوازی کەوکەب دروست نەبوو. ئیدی من سەربازەکانم دەفرۆشت و بە پارەکەیان دەژیام، وەکو چۆن ئیٚستاش هەر بەوە دەژیم بەلاٚم فایدەی چی! ئەو سەربازەی هەوەڵ، ئەو سەربازە دروست نەبوو و نەبوو، بە یەك ساڵی تەواو دروست نەبوو. بە رۆژ ئەمە کارمان بوو و شەوانیش بەدوو قۆڵی قسانمان دەکرد، هەندیٚ جار کەوکەب باسی میٚردەکەی، کە ئیٚستا لە لەشکردایە، دەکرد.." لیٚرەدا من قسەکەی (ف)م بڕی، چونکە نە لە هەوەڵو نە لە کۆتایی سەربورەکە حاڵی نەبووم. ئاخر پیاو لەبەر خاتری کارەکەریٚك ئەو هەموو زەحمەتەی

خۆی نادات، لێ هەستم دەکرد کە ئەم سەربورە زۆر کاری لەو کردووەو یەجگار پەرێشانی کردووە، هەستم دەکرد کە مەسەلەیەکی گرینگ دەشارێتەوە. بۆیە لێم پرسی: "باشە خۆشت دەویست؟ خۆ تۆ خۆت یەکەمجار گوتت هیچ پەیوەندییەکتان لە نێوانا نەبووە".

هاوڕێکەم وەڵامی نەدامەوەو لەسەر قسەکەی خۆی ڕۆیی: "دوای چوار هەیڤان ئاقیبەت هاتمە سەر ئەم بیرەی کە لەوەیە ئەو سەربازە قورقوشمینەی کە کەوکەب باسی دەکات هەر بوونی نەبێ،بۆیە ڕۆژێك بەیانی کە رابووم، لە جیاتی ئەوەی سەربازی قورقوشمین دابڕێژم، دەستم بە دارتاشینو قاڵب دروستکردن کرد. دەمویست بنیادەمێکی ترسناك دروست بکەم. بەڵام ئەم قاڵبە بە دڵی خۆم دەرنەچوو، ئەوە دەرنەچوو کە من دەمویست. دەموچاوی بە گوێرەی تەسەوری من دەر نەدەهات. من دەمویست ترسناکی دروست بکەم کەچی لە خۆڕاو بەدەر لە دەسەڵاتی من بە شێوەی بابم دەردەچوو... من چەندم ئەزیەت بەم قاڵب گرتنەوە کێشا، ئەمەیان با بمێنێ. چونکە نەك تۆ، هیچ کەسێك ناتوانێ تێی بگات. تازە دەپرسیت، باشە تۆ خۆشت دەویست؟ خۆشەویستی چی؟ من نسیبەت و بەڵای لەمە گەورەترم چەشتووە.

ئەوە لەزەتەی کە بۆ تۆ ئاساییە، بۆ من دەردو عەزابە. من مەحکوم بووم بەوەی کە نە توانم خۆشەویستم هەبێ. هەزارو یەك دەردو عەزاب لە دنیادا هەیە. کەس نەیتوانیوە ئەم بەڵایە وێنا بکات کە لەگینە خەڵکانێك هەبن کە نەتوانن خۆشەویستیان هەبێ، خۆشەویستی بکەن. بەڵا، بەڵاش ناوێکی تری دەردی منە. ئاه، تاقەتم نییە.. ئەم سەربازە دروست بوو، بەڵام بە بەهای ژیانی من، ئێستا دوای ساڵێك تێ گەییشتم کە هەق بە کەوکەب بوو، ئەم سەربازە قوڕقوشمینە لەوانە نەبوو، ئەنجام دانەیەکم دروست کردو لە بوخچەکەیم نا، چەند شەوێك ئەم کارەم دووبارە کردەوە.. تەواو، وەرزی یەکەمی ژیانی من تەواو بوو. بەیانییەك کە لە خەو رابووم سەیرم کرد کەوکەب نەماوە".

*  *  *

پاشماوەی سەربوردەکەی خۆی بۆ نەگێڕامەوە، ئەو ڕۆژە کۆکە دەرفەتی نەدا، بەڵام ئەسڵی شتەکە ئەمە بوو کە لە پرسیارەکەی دوایی من قەڵس بوو. ڕۆژی دوایی کە چووم گێولی نەبوو. دواتریش چەندم کردو کۆشا، نەهاتە ڕەداو ملی نەداو نەدا، بەڵام ئەم مل نەدان و قڕوقەپ کردنەی ئەو زیاتری خستمە سەر کەڵکەڵە. وام زەن دەبرد کە لەوەیە تاوانێکی کردبێو بیەوێ لە پڕێکا دانی پێدا بنێ، تا ئاسوودە ببێ. بۆیە زیاتر هاتوچۆی ماڵەکەیم دەکرد. ڕۆژێك لێم پرسی کە "کەوکەب لە کوێیە؟".

گوتی: "نازانم".

– پێت وایە مابێ؟

– بە هەر حاڵ بۆ من مردووە.

– ناتەوێ جارێکی دیکە ببینی؟

وەڵامی نەدایەوە. هەمدیش لێم پرسییەوە: "چەندە کە نەت دیتووە؟"

– ئەگەر دەتەوێ من ئاسوودە بم، ئیتر ئەم پرسیارانەم لێ مەکە، کەوکەب بەلای منەوە مردووە، وەکو چۆن دایکم مردووە.
قسەی لێ دەرنەدەهات. ماڵەکەی لە شەقامی ئیسماعیل بەزاز بوو. لەگەڵ دەرو دراوسێکانیدا سووکە ئاشنایەتیەکم پەیدا کرد، هەندێکم تاقیب کرد، بەڵام هیچم دەست نەکەوت. بە قاڵی سەری کۆڵانەکە دەیگوت ئێمە هیچ کاتێك نای بینین، کەمترین هاتوچۆکەری هەیە. هەندێ جار ژنێك دێت و یەکسەریش دەڕوات. قەتیش ڕێنەکەوتووە کە شەوێ کەسێك لە ماڵیا مابێتەوە. نۆکەری ماڵەکەی دراوسێی گوتی من تەنیا شەوێك ئەوم لە باخی فیردەوسدا بینی. ئەنجام لە میراوی گەڕەکەکەم، کە بەرێکەوت لەوێ بوو، ژنەوت کە زۆربەی شەوان لە کوچەکانی سەر قەبری ئاغاو مەیدانی پاقاپق دا سەرگەردانە، دەمەو بەیان بۆ ماڵ دەگەڕێتەوە. من وام مەزندە دەکرد کە ئەم ژنە کەوکەبە، بەڵام پاشان دەرکەوت کە ئامین خانمی خوشکیەتی. بەڵام درەنگانی شەو خۆی لە دووی کەوکەب دەگەڕێ. ڕۆژێك لە حەوشەکەیا تووشی ئامین خانم بووم، ئەم ژنە لە بنی شووی نەکردبوو، لە سی ساڵیدا تۆبە دەکات و زیارەتێکی کەربەلا دەکات و پاشان دەبێ بە مەلا باجی و ئێستا تورەقی کردووەو لە حوجرەی کیژاندا دەرسی قورئان دەڵێتەوە، هەر چۆنێ بوو هەندێ قسانم لەو دەرهێنا.
ئامین خانم دەموچاوێکی باریكولاوازی هەبوو. وشکە بیرۆیەك بەسەر لا لێویەوە بوو کە زۆر لێی ناشیرین بوو. ئامین خانم هێشتا شووی نەکردبوو و هەمیشە تەزبێحی دەگێڕاو زیکری دەکرد، من دەمویست بزانم کە ئاخۆ هیچ زانیارییەکی لەمەڕ ژیانی براکەی لە بوشەهر هەیە یان نا. کەمێك ڕووبەندەکەی بەرز کردەوە، دەمتوانی لە ژێر چاوەوە وشکە بیرۆکەی ببینم، گوتی: "خوایە لێم نەگرێ، ئەگەر بابی ڕەحمەتیم بزانێ کە ئەم جۆرە کوفرانە لە زارم دەردەچێ لە گۆڕەکەدا رادەچڵەکێ، بە تایبەتی بابم کە هیچ خۆشی بەم منداڵەدا نەدەهات. بە پێچەوانەی دایکمەوە، دایکم ئەمی زۆر خۆش دەویست، هەر بەو منداڵیە، وێڕای ئەوەی کە من کچێکی گەورە بووم، ئامادە بوو کە هەموومان، هەر پێنجمان لە گۆڕ بنێ، بەڵام تاقە موویەك لەسەری ئەم کەم نەبێتەوە. لە کاتێکا کە ئەو پاشەبەرەش نەبوو، خوای لێ خۆش بێ خۆشکە بچووکەکەم، بەگم خانم، کە قەزاو بەلای تۆ برد، دوا بەرەی بوو، شووی کرد، پێکڤەیان نەکرا. ئەوجا دیقی کردو مرد، بەڵام مەحەبەتی دایکم دەرهەق بەم منداڵە لەوەیا نەبوو، ڕوحیان بەسەریەکا دەردەچوو، وەکو ئاشقەو ماشقە بوون، دایکم هەمیشە بە ئەسپایی و لە بن لێوانەوە پێی دەگوت: تۆ یوسفی منی. بەڕاستیش وابوو، ئەمیش هەر وابوو. ڕاستیت دەوێ، ئەم منداڵە لە داخ و سوێی مەرگی دایکم وای لێهات، لەو کاتەوە ئیدی لە دەست دەرچوو، دایکم تۆزێك بەر لە ڕۆیشتنی ئەم بۆ بوشەهر، عومری بۆ تۆ بەجێهێشت. لە بنج و بناواندا سەفەری بوشەهرش لەسەر ئەمە بوو کە بابم ژنی هێنایەوەو ئەمیش نەیدەویست پاش مردنی دایکی ئەم ژنۆکەیە لە ماڵەوە ببینێ، دەزانی چیە؟ باوکم چاوی بەم کوڕەدا هەڵنەدەهات. لە ژێر کورسیەکەدا دانیشتبووین، کە پێی ئەم منداڵە بەر کورسیەکە دەکەوت و چراکە دەجولا، مەگەر خوا بزانێ چی دەکرد. لەسەر قەڵەم و کتێبی قوتابخانە شەڕیان بوو، لەسەر درەنگ هاتنەوە

شەڕیان بوو، لەسەر شیڤ شەڕ بوو، لەسەر فراڤین شەڕ بوو. ئەگەر دەزانی ئەو مردوو مراوە، دایکم چەندی جەورو جەفا لەسەر ئەم جووتە کێشا، دڵی هەر موسوڵمانێك بۆی توێ توێ دەبێ. ئەنجام رۆژێك باب و کوڕ شەڕەکەیان کرد بە راست، شەڕێکی وەها کە هەرچییەکیان بەدەما دەهات بە یەکیان گوت. ئەم دەیگوت تۆ لە جیاتی ئەم هەموو سیغەیە، ئەگەر یەك تۆزت خەرجی دایکم کردبا نەدەمرد، بەڵام بابم چی دەگوت: زمانم لاڵن،زمانم لاڵ، حەوت قورئان لە بەینا بێ، قەت تۆمەت نادەمە پاڵ کەس، دەیگوت کە تۆ دەستدرێژیت کردووەتە سەر ژنەکەی من. بەڵام ئەمە درۆیە. ئەم درۆیە ئەو ژنەکە چاو داقڵیشاوە، کە ئیلاهی دڵو جەرگی لەسەر تاتەشۆر بکەوێتە خوارەوە، هەڵی بەست، ئیدی لەو ساوە ئەمیش گوتی کە من ئیتر نامەوێ لەم ماڵە وەمێنم".

پاشان من پرسیم: "یانی ئاگات لە ژیانی ئەو لە بوشەهر نییە. ئەدی کە لەوێندەر گەڕایەوە ئاگات لێی هەیە؟.

– با، دەربارەی شیرازیش بە خۆی هەندێ شتی بێ سەرو بەری بۆ گێڕاومەتەوە. بەڵام من باش حاڵی نەبووم. خودا تۆوی ئەم ژنانەی کە من دەیان ناسم لەسەر رووی زەمین بېڕێتەوە. ئەرێ، کە لە بوشەهر گەڕایەوە، ئەم نەخۆشییەی لەگەڵ خۆیدا هێنا.

– نەخۆشی چی؟

– مەگەر نازانی؟ ئەم شێتێتییە، ئاخر هەوەڵجار کە لە بوشەهر گەڕایەوە، لای منو لە ماڵی مندا بوو. هەموو بەیانییەك کە لە خەو رادەبووم، دەمدی هەموو بەرو بوخچەکانم هەڵرێژراوەتە ناو ژوورەکان، تەنانەت دووگردەکەشم کە دەستی فەلەکی نەدەگەیشتێ، لە ژوورەکەدا تووڕ درا بوو، رۆژی یەکەم وامزانی دز هاتووە، دوایی سەیرم کرد هیچ شتێك گوم نابێو ئەمە کاری هەموو رۆژێکە، شەوێك خۆم لێ داگرت، سەیرم کرد خۆیەتی، شەو کە دەخەوتم هەڵدەستاو ناو بەروبوخچەکانم دەگەڕا. لێم پرسی کە ئەمە چ کارێکە، نەخێر هەر چەندم دەگوت گوێی نە دەدامێ، بەیانی کە لێم دەپرسی، هەر ئاگاشی لێ نەبوو، دیقەتم دا کە ئەمە دەردێکی بێ دەرمانەو پێوەی موفتەلا بووە، دەتگوت لە شتێك دەگەڕێ، ئێستاش هەروایە، شەوان لە پڕ رادەبێ، هەر شتێك کە وەکو بوخچە بێ، دەیکاتەوە، لە هەمووی خراتر ئەم ئەسپێیانەیە کە لە هەموو لەشی داوە، ئەسپێ بە سەرو رویا هەڵدەگەڕێ، من ئەمەم لە حاجی میرزا رەزای حەکیم باشی پرسی، دەڵێت، ئاقیبەت کوێری دەکات! خودا شایەدە من دڵم بە بەرێوە نەماوە، بەڵام منی بەدبەخت چی بکەم؟

*　　　*　　　*

ئایا هەیڤە شەو جوان نیە؟ ئەدی مەعنای چی. چونکە هەر هەموو دیمەنانی ئاشقانەو شاعیرانەی شاعیران و نووسەران یەکسانە بە زوڵفی پەرێشان و رەخی جوێبارو هەیڤە شەو، بێ خەبەر لەمەی کە هەیڤە شەویش لە هەلومەرجی دی دا خراپ و باشە. بەڵام هەیڤە شەو لەگەڵ ئەو ژنانەدا کە بە هایان دەشاهیە، لەگەڵ ئەو چێودارانەدا کە بۆ شار دێن و بە نەخۆشی

وخەم و ئازارەوە بۆ گوند دەگەڕێنەوە، یەکسانە بە نەگبەتی و بەدبەختی، ئەم هەیڤە شەوەی کە من بینیم، ئەو هەیڤە شەوە وەکو چڵکی سپیە کە رژاوەتە سەر شەقامەکانی باشووری شارو ئەم عەبا رەشانەی کە لە گۆشەو کەناری کۆڵانەکاندا بەسەر دیوارەکانەوە چەسپیوون، وەکو خوێنی قەتماغەی سەر برینن، من بە دوای یەکێك لەوانەدا دەگەڕێم، زۆرجار دەچم بۆ لای یەکێك لەوانە دەڵێن: "وەرە ناو کۆڵانەکە". کاتێ کە دەچم ناو کۆڵانەکە دەڵێن: "جاریێ دەشاهی بدە."

من بە دوای کەوکەب دا دەگەڕێم. بتەوێ و نەتەوێ چارەنووسی هاوڕێکەم کاری تێکردووم، نێو چەوانی گرژ، چاوانی ریپۆق گرتوو، تلیاك خەریکە دەیکوژێت. تەنێ ئەم ژنە دەتوانێت فریای بکەوێ، رزگاری بکات. من لە دڵی خۆمدا بیر دەکەمەوە، ئەگەر گریمان بشمرێ، چ کارێکی لەسەر سیستەمی دنیا هەیە. ئەم بیرە لە شوێنی خۆیدا لۆژیکی و دروستە. بەڵام... لەوەیە کەوکەبیش بۆ خۆی ئەندامێکی بە سوودتر بێ بۆ کۆمەڵگە... بەڵێ، بە سوودتر لە ئاغای چێوار.

کەوکەب، شەوانی لە کوچەو کولانەکانی دەوروبەری باخی فیردەوس دەقەتاند، لە سینەمای تەمەدونەوە تامەیدانی شاوگارد ماشین، ئەم شوێنانە هێڵی هاتوچۆو قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی ئەوە. گریمان وا کەوکەبیشم بینی، دەتوانێ چ بکات؟ لەگینە ناچاری بکات کە ببێتەوە بە بەشەر. ئەم ژیانە گواویە بەم جۆرە بەردەوام نابێ.ماوەیەکە من و ئامین خانم ژیانی بەرێوە دەبەین. بەتول قەولی داوە کە ئەمشەو هەر چۆنێ بووە کەوکەبم بۆ لا بێنێ.

* * *

"تۆ ئەگەر منت بوێ، من ئیدی ناچمەوە بۆ لای ئەم بۆرە پیاوە قوڕمساغە، خوا دەزانێ چەندم زەحمەت و تاڵاو بە دەستیەوە کێشاوە. تۆ نایزانی، من گیانی خۆم نایە سەر ئەو، خۆم لە پێناویا کوشت هی خودا بیکوژێ، رەنگە تۆ لە دڵی خۆتا بڵێی، چەند ژنێکی دڵڕەقم، بەڵام بە زاتی خودا، بە گیانی بابم وا نیە: رێم بدە با لە نووکەوە بۆتی بگێڕمەوە. من لە بوشەهرا ئاشنایەتیم دەگەڵی پەیدا کرد، ئەو زەمانە کوڕێکی باش بوو، من کارەکەری بووم، هەموو کارەکانیم بۆ رێك دەخست و من زەبت و رەبتم دەکرد، شەوێك پێی گوتم: کەوکەب من تۆم زۆر خۆش دەوێ، تۆ وەکو دایکمی، تۆ نازانم، چاوانت لە چاوانی دایکم دەچێت، زارت چۆنە، کە پوت چۆنە، من ئەوساکە پاك و بێگەرد بووم، دەتگوت پەڕەی گوڵم، هێشتا نا مەحرەم سەری نینۆکی نەدیتبووم، بە هیچ جۆرێ بە حەرامی رازی نەبووم، من نەمدەزانی کە ئەمە چی لە گیانی من دەوێ، شەوێك بە ساویلکەیی خۆم پێم گوت من ئامادەم ببمە سیغەت، سبەینێ وەرە بچینە لای ئاخوند و کارەکە بڕێنینەوە، تۆ ئەگەر من بە شایستە دەزانی و دەتەوێم، من لاریم نییە. لە نکاو میناکی دینان دەستی بە پێکەنین کرد، منیش کە دیتم واهیە، ئیتر چ قسەیەکم نەکرد".

کەوکەب لە ژێر کورسی ژوورەکەی مندا دانیشتبوو، لێکدا لێکدا عەرەقی دەخواردەوەو دوکەڵی بەبا دەداو سەربوری خۆی بو من دەگێڕایەوە. دەموچاوێکی چرچی سەوزەڵەی شیرین گرۆیی هەبوو. گێسوەکانی وەکو چێوەی گسکە نەرمە کەوتبووە سەر دەموچاوی، بە شێوەیەکی گشتی کەوکەب تەنیا جوان نەبوو، ئیدی هەموو عەیبێکی تری هەبوو.

من لە پڕ سەربازە قوڕقوشمینەکانم وەیاد هاتەوە پرسیم: "باشە مەسەلەی سەربازە قوڕقوشمینەکە چ بوو؟"

– دە تەمەشا، ئەمەی بۆ تۆش گێڕاوەتەوە، ئەمە شێتە شێت، بە قەبری بابم درۆ ناکەم، ئەمە چاوەزارێك بوو کە من بۆ خۆمم کڕی بوو. چاوەزار نەبوو، بەڵام راستت گەرەکە، من ئەو زەمانە مێردە سەربازەکەمم زۆر خۆشدەویست و ئەوەم بە یادی ئەو کڕی بوو، کاتێ کەوتبوو، یەجگار خەمبار بووم، بەڵام ئەمە ئەم هەموو هەرایەی ناوێ، ئەمە فێل و تەڵەکەی خۆی بوو. دەیویست من لەوێ لە وڵاتی غوربەتا بهێڵێتەوە، شەوێك هەستام، سەیرم کرد سەربازێکی لەو سەربازانەی کە ئەوسا پێکڤە دروستمان دەکردن، بەڵام ناشیرین و بێ قەدو قەوارەو رووت، وەکو دێوی سارایان، ناتوانم باقیەکەی بڵێم، دروستکردووەو خستویەتیە ناو بوخچەکەی منەوە. منیش راستت دەوێ ترسم لێ نیشتو بەیانی هەڵاتمو هاتم بۆ شیراز، لێرە شووەکەم نە دۆزییەوە، تاقیبم کرد گوتیان ژنی هێناوەتەوە، ئەمەش بەزمێکی خۆی هەیە، لێرە چ تاڵاوێکم چەشت، با ئەمە بمێنێ. دەوجا وەرە ژنێکی تەنیا لە شارێك دا بێ کەس چ بکات، من هیچ کارێك بەڵەد نەبووم، چونکە گەنج بووم، لە هەر شوێنێکا دەمویست کارەکەری بکەم، خانمی ماڵ رازی نەدەبوو، خۆ ئەگەر ماڵەکە خانمی نەبوایە لە دەست ئاغای ماڵ نەدەحەوامەوە. ئەنجام یەکێك لەم شوفێرانە ماوەیەك رایگرتم، پاشان منی هێنا بۆ تاران، ئیدی من لەو ساوە کەوتمە ناو ئەم گێژەنگە، رۆژێ لە باخی میللی دا پیاسەم دەکرد، لەوێ دیتمی، دەستێکی بە سەرو روویدا هێنا بوو، هەر کە چاوی بە من کەوت، بە دوومدا هات و بردمی بۆ ماڵەکەی خۆی، هەر چیم کردو کۆشا، نەیهێشت لە ماڵ بێمە دەرێ، نازانم چۆنت تێ بگەیەنم، هەموو قسەیەکی دەگەڵ مندا ئەمە بوو کە تۆ وەکو دایکمی و من وەکو دایکم خۆشم دەوێی، کە پێم دەگوت، باشە ئەگەر تۆ منت دەوێ وەرە شتێکم لەگەڵ بکە، یان بمخوازە، یان سیغەم بکە، ئاخر واهی نابێ، هەمدیس دەیگوت: نا، تۆ دایکی منی، خۆ پیاو ناتوانێ دایکی بخوازێ.

من قسەکەیم بڕی: "باشە ئەگەر تۆی دەویست، بۆچی نەیدەخواستی".

– نازانم چۆنت بۆ بگێڕمەوە تا تێ بگەی، پیاو نەبوو، وەکو شێتان خۆی بەسەردا دەدام، سەروچاوی ماچ دەکردم، هەر کە من دەستم بۆ دەبرد، لێی دەدام، جنێوی دەدامێ، قژی دەسکەنە دەکردم، رۆژێك هێندەی دارکاری کردم کە لەخۆ چووم، لە ماڵەکەی هەڵاتم، دەچوومە هەر شوێنێ، لە بەردەمما قوت دەبووەوە، دەیدۆزیمەوە، دیسانەوە بۆ ماڵەکەی دەهێنامەوە، جارەکی دی دەڕەڤیم، یەك ساڵی خشت ژیانی منی نەگبەت و بەلەنگاز بەمجۆرە بوو.

لێرەدا گریان ئەوکی کەوکەبی گرت:

"لەم ماوەیەدا من لەگەڵ کەسی تردا نەبووم، من راست و رەوان بۆتی دەگێڕمەوە، دەزانی من لە کەس ناترسم، باکم بە کەس نیە، لە فەلەکیش ناترسم، بزانە، لە کافتیریاکاندا رێگەیان نە دەدام، نەم دەتوانی لە شەقامی لالەزارو ئەسلامبولدا بوەستم، جێی من ئەم گۆشەو کەنارانەی سەر قەبری ئاغایە. جا بویە نۆکەری خۆمم، هیچم نیە کە بتوانن لێمی بدزن، هەر گیانمە، ئەویش ئامادە بووم فیدای شاگرد شوفێرەکانی بکەم. کێ دەتوانێ هەقی بەسەر منەوە هەبێ، ماڵ، ژیان، مێرد، منداڵ، باوك، سەروەت، دەوڵەت هیچم نیە، بۆیە لە فەلەکیش ناترسم، ئەگەر تۆ منت بوێ، من ئیتر ناچمەوە ماڵی ئەم بۆرە پیاگە، بەڵام ئەگەر بچمەوەش، بیەوێ دەستم بۆ بێنێ، بابی بابە سەگەکەی دەردێنم، ئەمجارە دەیکوژم، لەچی دەترسم؟ مەسەلەی دوا شەوەکە نازانی؟.

"پار زستان بوو، من شەوێ چوومە ژوورەکەم تا بخەوم. سەیرم کرد لێفەو شتەکانی ژوورەکە سووتاوەو ئاوی پێدا کردبوو کە بیکوژێنێتەوە، تومەز کە من لەوێ نەبوو بووم، هاتبوو و بوخچەکەی هەڵڕشتبووم و هەموو کورسییەکەی پێکادا بوو، ئیدی ئاگری مەقەڵیەکەی رشتبووە سەر لێفەکە، و نزیك بووە ژوورەکە گڕ بگرێ، ئیدی بە خۆی چووە ئاوی بە ژوورەکەی منی بەدبەختا کردووە، جا ئێستا شوێنی خەوتنم نیە، وەکو بی دەلەرزم، ئەوەندە هەوڵدەدەم کە لە ژوورەکەی خۆیدا جێم بکاتەوە، رازی نابێ و نابێ، ئەنجام پیاوێك لەم ماڵەی دراوسێی ئێمەدا بوو، دەستی گرتم و بردمیە ژوورەکەی خۆی، چی بکەم، شوێنم نەبوو، بەیانی کە بەمەی زانی، دەیویست ئەم داماوەش بکوژێ، هاواری دەکرد کە تۆ خیانەتت بە دایکم کردووە، هەر دەتکوژم، من لە ترسی ئەوەی کە نەبادا شتێکی خراپ بقەومێ، هەڵاتم و ئیدی بۆ ئەوێندەر نەچوومەوە؟و ئەگەر تۆ لەت و پەتیشم بکەی ناچمەوە".

من کەوکەبم لەت و پەت نەکرد، بەڵام تۆزێکم پارە دایە، عەرەقەکەش کاری خۆی کردبوو، بەلەنگازە جێ و رێشی نەبوو، ئەوە بوو دەستم گرت و بردم بۆ ماڵی هاوڕێکەم، کاتێ کە کەوکەب وەژوور کەوت، من مودەتێك لەبەر دەرگا وەستام، چونکە هیچ دەنگە دەنگ و هەرایەك نەهات، گەڕامەوەو رۆیشتم..

*   *   *

رۆژی دوایی دنیا بێ ئەندازە سارد بوو، بەفر سەراپای شاری گرتبوو، کە لە دایەرە هاتمە دەرێ، چووم بۆ سۆراخی هاوڕێکەم لە شەقامی ئیسماعیل بەزاز. دەرگای ماڵەکەی داخرا بوو و مۆر کرا بوو، مودەتێك بە شەقامەکەدا پیاسەم کرد، پاشان هاتمە مەیدانی شاو لەوێندەرەوە سواری پاس بووم تا بۆ ماڵ بڕۆمەوە. لە پاسەکەدا باس باسی ئەمە بوو کە دوێ شەو، پیاوێك ژنێکی خنکاندووە. لە نزیکی کوچەی دەردار، پیاوێکی جانتا بەدەست وەستا بوو و خەریك بوو لاملی دەخوراند. شاگرد شوفێرەکە ئەم نەفەرەی نەبینی. شوفێرەکە بەخۆی پاسەکەی راگرت و بە شاگردەکەی گوت: "دەی ئەو دە شاهیە هەڵگرە". ئەو پیاوەی کە خەریك بوو گەردنی دەخوراند، دەستی کرد بە گیرفانیا، دیار بوو بۆ پارە دەگەڕا، کە ویستی سواری

پاسەکە بیٚ، جانتاکەی بەر رکێفی پاسەکە کەوت، کرایەوەو ژمارەیەکی زۆری سەربازی قوڕقوشمین رژایە سەر بەفرەکە. شوفێرەکە چاوەڕوانی نەکردو کەوتە ریٚ. ئەو پیاوەی کە ئەستۆی دەخوراند سەربازەکانی گرد کردەوە. جانتاکەی بەدەستەوە گرت و هاواری کرد: "بوەستە!" بەڵام شوفێرەکە گوێی نەدایێ، شاگردەکە گوتی: "دەبڕو! قوڕمساغ پێت وایە مەردم ئازاری باشە.".

تهران– دی ۱۳۱۳
((۱۹۳٤))

# شیکپۆش

"ئاغای نواپور ناناسیت؟" یەکێکە لە لاوە نوێخوازو منەوەرو بەزەوق و بەهرەدارەکان، ئەوەی راستی بێ، یەجگار زاناو داناو خودان بەهرەی خۆڕسك و بابەتییە، سەبارەت بە نەجابەتی بنەماڵەکەیان چیت عەرز بکەم، هەموو خەسڵەتێکی باش و سوخەت و سیفەتێکی پەسندیان تێدایە.

بەمجۆرە ئاغای (نواپور)یان بەم بەندەیە ناساندو بەندەی بچووك و لاواز، نووسەری ئەم دێڕانە دەبێ بیسەلمێنم‌و ئیعتراف بکەم کە هەر هەموو ئەو خەسڵەتانەی سەرێ لەواندا هەبوو. من زۆر جار دەگەڵ هاوڕێکەمدا لە (کافتیریای رۆژ نوئار)دا شەترەنجم دەکردو ئاغای نواپوریش کە شەترەنجی بە گەمەی منەوەرو رۆشنبیران دەزانی، هەندێ جار کاتێ کە ئێمە گەمەمان دەکرد تەشریفی دەهێناو تەمەشایان دەکرد. هەڵبەتە من بە هیچ کلۆجێ نامەوێ تەوس بە ئاغای نواپور کە لە جوملەی لاوانی منەوەرە بکەم‌و خوانە خواستە بڵێم کە ئەویش وەکو هەندێ کەس نیوەی تەمەنی پتر لە چاخانەو کافتیریاکاندا رادەبوێرێ، نەخێر، تەنیا عەسران، لە سەعات پێنج دا تەشریفیان دەهێنا، سەعاتێك لەوێ دادەنیشتن و پاش خواردنەوەو خواردنی قاوەو چاو شیرینی بە زمانی بەندە بۆ (قەڵا ئاوەدان)ەکەی و بە زمانی خۆی بۆ (کوخە وێران)ەکەی تەشریفی دەبردەوە. ئیدی پێم وانیە پێویست بکات باسی ئەوە بکەم لە روخسارو ئەندامی ئاغای نواپور لە لاوە نوێخوازو منەوەرو رۆشنبیرەکانە، چۆن بوو. هەڵبەتە هەر کەسێك میناکی خودی ئاغای نواپور هۆشمەندو زیرەك بێ یەکسەر دەتوانێ بە مەزەندە پەی بەمە بەرێ، هەڵبەتەو بێگومان هەموو هەفتەیەك سەری موبارەکی چاك دەفەرموو، ردێنی شەریفی هەموو رۆژێك دەتاشی، بە دەستەسڕی ئاوریشمین چاوی دەسڕی، دار جگەرەیەکی جوان و ناسکی دەخستە لا لێوی —بەڵام زمانم لاڵ بێ خوا نەکردە کەسێ وا زەن نەکات کە ئەم رەفتارانەی ئەو ناشایستە بوو یان کەمێك دەچووەوە سەر رەفتاری لاوانی لە ئەورووپا خوێندوو، نا، ئەستەغفیروڵلا، تا ئێستا هیچ کەسێك هەرگیز لەم سیفەتانەی لەودا نەدیتووە، تەنانەت دژمنانی قەستە سەریشی (هەڵبەتە دژمنی نەبوون، ئەگەر خوا نەکردە دژمنی هەبوایە) دەیان سەلماند کە بوونی ئاغای نواپور لەم جۆرە خەسڵەتە نزمانە بە دەرو دوور بوو— بەڵام هەر چەندە حەز ناکەم بەتانی قسادا بچم و درێژە بە باسی رواڵەتی بدەم، چونکە نیهادو جەوهەری تەژی ماناو حەقیقەت بوو و شەرح و شرۆڤەی جەوهەرو ناخی بە ئەرکی بێ چەندو چوونی خۆم دەزانم، بەڵام چیتر خۆم پێ ناگیرێ کە سەبارەت بە پاڵتۆکەی ئەو چەند قسەیەك نەکەم و دڵی ئاشقانی پاڵتۆ شیکەکەی ئەو بە نوکی قەڵەم پاندانەکەم بە جۆرێ ئەنج ئەنج بکەم کە هیچ هەتوانێك بۆ تیمار کردنی دەست نەکەوێ. بەڵام حەیفێ کە قەڵەمی من لە ئاستی ئەم مەوزوعە گرینگە کۆڵەو زمانم لاڵە. کاشکێ شاعیر بایەم و بمتوانیبا شیعر بڵێم: باڵا پۆشێك چوون زوڵفانی یارم سیا بەڵام حەیفێ کە بەهرەم وشکی کردووەو هەرچی دەکەم و دەکۆشم، ناتوانم سیا لەگەڵ فتا بکەم بەهاو قافیە. لە کوێوە

دەست پیێ بکەم؟ ئەی خوێنەری هەژی، بە چ جۆرێ پەسندی پاڵتۆکەی ئاغای نواپور بدەم؟ لە کوێی بابەتەکەوە دەست پیێ بکەم؟

من ناچارم لەو رۆژەوە کە پاڵتۆکەی ئاغای نواپور بووە مایەی سەرنجم، باسەکەی بۆ خوێنەرانی هەژی کە وەختی شەریفی خۆیان سەرفی خوێندنەوەی تورەهاتە بێ سوودەکانی ئەم بەندەی حەقیری نووسەری ئەم دێرانە دەکەن، شرۆڤە بکەم. ئەم بەندەیە رۆژێ لە رۆژان لە کافتیریای (رۆژی نوئار) رۆنیشتبووم و چاوەڕوانی کەسێك بووم کە بێتو یاری شەترەنجم لەگەڵ بکات. بە رێکەوت ئاغای نواپور کە لە جوملەی لاوانی نوێخواز و منەوەرانە، تەشریفی هێنا، سەرەتاکانی پاییز بوو و ئەگەر درۆم نەکردبێ، پاڵتۆ بارانیەکەی ... بەدەستەوە بوو.

داوام لێکرد کە یاری شەترەنجم لەگەڵدا بفەرموێ، بەلاّم جەنابیان داواکەی ئەم بەندەی حەقیرە، نووسەری ئەم دێرانەی قەبوڵ نەفەرموو، ئیشارەتیان فەرموو کە دەبێ تا سەعات پێنجو نیو بڕواتو چاوەڕوانی یەکێك لە هاوڕێ بەڕێزەکانیەتی تا پێکڤە بچن بۆ خەیاتخانە، پاشان نموونە قوماشێکی لە بەرکی موبارەکی دەرهێناو دای بە من و پرسی کە ئەم پارچەیە چۆنە؟

بەندە چونکە شارەزایی کافی و وافی-م لە جیاکردنەوەی قوماشی باش لە خراپ نەبوو، وەلاّمی بنجبڕم نەدایەوەو جەنابیان بۆ شارەزایی بەندە شەرح و شرۆڤەیەکی تێرو تەسەلی سەبارەت بە ئەنواع و ئەشکال پارچەو قوماش، بە تایبەتی قوماشی ئینگلیزی و های لایف و ئینگلیش تویلەرسو لەوەرگاکانی ئوسترالیاو درونگەکانی لەندەن و پاریس و مۆدێن تازەی ئەورووپاو ئەو گۆڤارە ئەورووپاییانەی کە باسی زانستی جل و بەرگی تازەیان تێدا بڵاودەبێتەوەو کاریگەری و گرینگی جل و بەرگی خەڵکانو... شەرح و شرۆڤە فەرموو، و دڵنیام گەر هاوڕێکەی لە کاتی خۆیدا تەشریفیان نەهێنابا، هەر دادەنیشتو لەسەر باسەکەی دەڕۆیی، و لەوە بوو لە سەعات هەشت، کە کاتی تەشریف بردنەوەی بۆ ماڵ بوو، درەنگتریش تەشریفی بردباوە، نازانم بە ڕاستی بۆچی حەزی دەکرد، زانیاری بەندە سەبارەت بەم بابەتە زیاد بکات.

کاتێ کە هاوڕێکەی تەشریفی فەرموو، هەوەڵجار قوماشەکەی پیێ نیشانداو پاشان ئەم گفتوگۆیە کەوتە نێوان ئاغایانەوە.

ئاغای نواپور کە لە جوملەی لاوانی منەوەرو نوێخوازە، فەرموویان: "ئەم قوماشەت بەدڵە"؟

هاوڕێکەی: "بەڵێ، بەڵێ، قوماشێکی فرە خاسە، بە راستی من هەمیشە سەرسامی سەلیقەی جەنابتانم. لە بیرتانە بەندە نزیکەی سێ دانە هەیڤان بە دوای قوماشی پاڵتۆدا گەڕام و ئاخریشی وەکو جەنابت ئاگاداری قوماشی دڵخوازی خۆم نەدۆزییەوەو ئاقیبەت ئەو قوماشە پیسەم کڕی".

ئاغای نواپور، "نا، ئەو قوماشەی کە جەنابت هەڵتبـژاردووە، زۆر چاکە، بەلاّم لەوەیە ئەوسا لەم قوماشە لە بازاڕا نەبووبێ. دەزانی ئاغا ئەم بازرگانانە سەلیقەیان نییە، هەندێ جار بە رێکەوت بڕێ شتی باشیان لە دەست دەردەچێت. وەکو چۆن بۆ نموونە خەیاتی باش نییە".

هاوڕێکەی: "بەراست ئاغای نواپور، جلکەکانت داوە بەکێ؟"

نواپور: "بەندە بۆ هەمان مەسەلە داوام لە جەنابتان کردبوو کە تەشریف بێنی تا پێکڤە بچین بۆ لای ئەو خەیاتەی کە من جلەکانم داوەتیٚ، تا لە کاتی پراوەدا جەنابتان تەشریفی هەبیٚ. من جلکەکانم داوە بە (بارلی) و بە قەناعەتی من لە ئێرانا کەس لەو باشتر نییە".
هاوڕێکەی: "ئاغای ئازیزم، من قەناعەتی تەواوم هەیە کە جەنابتان لاوێکی نوێخوازو منەوەری، لەگەڵ ئەمەشا زۆر بە داخەوەم. ئەم (بارلی)یە جلەکانت خەسار دەکات".
ئاغای نواپور: "باوەڕ ناکەم".
هاوڕێکەی: "عەرزی با خزمەتتان دەکەم کە ئەم بارلییە تا ئێستا دوو جاران جلی منی سەقەت کردووەو لە ئەنجامدا فڕێم داوە".
ئاغای نواپور: "تازە هیچ چارەیەك نیە".
هاوڕێکەی: "چۆن چارە نیە، هێشتا نەچووە بچیٚ، تەشریف بەرەو لێی وەربگرەوە."
ئاغای نواپور: "نا، نابیٚ، ئەمڕۆکە نۆرە پرۆڤەمە. ئەمە جگە لەوەی کە من قەناعەتم بە فەرموودەکانی جەنابتان نیە. بارلی خەیاتێکی خاسە".
هاوڕێکەی: "ئاغای نواپور تکات لێدەکەم، ئەگەر بە خۆت حەز ناکەی جلەکانت لەم پیاوە وەربگریتەوە، من بە ناوی جەنابتانەوە دەڕۆم و لێی وەردەگرمەوە.
ئاغای نواپور: "نا، سوپاسگوزاری لوتفی موبارەکتانم، بەڵام تازە هیچ کارێك ناکریٚ".
پاشان هەردووك ئاغا خوا حافیزیان کردو تەشریفیان برد، لەو رۆژەوە ئیدی من سەرنجم لەسەر پاڵتۆکەی ئاغای نواپور گیرسایەوە. دیارە بەو زەوقە سەر رێژەوە کە تایبەت بە جەنابیانە، بەڵگە نەویستە کە پاڵتۆکەشیان لە سەرانسەری ئێراناو بگرە لەوپەڕی وڵاتانی ئینگلیستان و ئەمریکاشدا تایبەت و بیٚ وێنەیە. بۆ هەڵبژاردنی فۆرمی پاڵتۆکە دوای سوود وەرگرتن لە بیست گۆڤاری مۆدی فەرەنگستان و ئەمریکا، پتر لە دوو رۆژ دەگەڵ هاوڕێیان و ئەهلی زەوق و ئەهلی هونەردا چەندین کۆبوونەوەی کردبوو. بۆ هەڵبژاردنی خودی قوماشەکەش سوودی لە کتێبانی جۆراوجۆر وەرگرتبوو لەگەڵ چەند کارخانەیەکی ئینگلیزیدا لە مەنچستەر نامەو نامەکاری کردبوو، ئەوجا ئەو قوماشە ئینگلیزیەی کە خورییەکەی هی ئوسترالیا بوو نەك هی ئیرلەندا، بەسەر قوماشەکانی دیکەدا پەسند دابوو.
کاتیٚ کە ئەم پاڵتۆیە تەواو بوو، هەموو دۆستان، ئاغای نواپوریان بۆ ماڵی خۆ دەعوەت دەکرد تا لەزەت لە دیتنی پاڵتۆکەی وەربگرن.
تا یەك مانگ و بگرە پتریش هەر چەند من ئاغای نواپورم دەبینی، باسی ئەو پیاوە دەگەڵ هاوڕێکانی و دەگەڵ مندا سەبارەت بە دوگمەیەکی پاڵتۆکەی بوو کە بۆ نەگبەتی خەیاتەکە خوار دروبووی و چەندی هەوڵ دابوو، کە حاڵی بکات کە شوێنی ئەم قۆپچەیە خوارە، بە گوێی نەکردبوو، لەبەر ئەمە زۆر پەست و بێتاقەت بوو.
هەڵبەتە بیروبۆچوونەکانی ئاغای نواپور دەربارەی جل و بەرگ لە هەموو لایەکەوە جوانە. رۆژێك شرۆڤەیەکی دوورو درێژی سەبارەت بە رەگ و ریشەی وشەی پاڵتۆ بۆ بەندە فەرموو، وشەی پاڵتۆ لە Paletotی فەرەنسیەوە وەرگیراوە کە هەمان وشەی Paltrotی هۆڵەندییە،و ئەمە لە

کۆنا جلێك بووە کە لەسەر جلی ترەوە لەبەریان دەکردو ئەم جلە لەگینە لە قاپوتی رۆمی یان نیوکۆتی کەشیشان چووبێ و لەگەڵ جبەو عەبای موسوڵمانان و خەرقەی دەروێش و سۆفیان و قاپوتی لبادی ئەهلی دیانەت و جبەی پیاو ماقولان و نزیکانی سوڵتانان و عەبای خانمان و خانان دا هاوتاو هاو شێوەیە.

مەبەستم ئەمەیە کە ئاغای نواپور لەولاوە سەرڤەو بێ موبالاتانە نەبوو کە زۆربەی کاتی خۆیان سەرف جلکان بکەن، زۆر کتێبانی ئەستووری موتالا دەکردو لە هەر بۆنەیەك دا نێوی کتێبی (ئینسایکلو- پیدیای بریتانیا) بە ئاوو تاوێکی تایبەیەوە ناو دەبرد. ئاغای نواپور کە لە جوملەی لاوانی منەوەرو نوێخواز بوو. هەمیشە بە جدی لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە کارو کردەوکانی خۆی، تەنانەت لە پاژانیشدا بە تەواوەتی دەگەڵ پرەنسیبی هزرو لۆژیك و مۆدێرنیزمدا بسازێنێ. هەڵبەتە من بیرم چوو ئەوەتان عەرز بکەم کە ئاغای نواپور زانیاریی یەجگار بەرزی هەبوو و لەم رووەوە بێگومان بە یەکێك لە ئەندامانی چینی بەرجەستەی ئێران دەژمێردرا. جەنابیان پۆلی سێیەمی ناوەندی لە قوتابخانەیەکی ئەمریکایی بڕی بوو، بەلام چونکە لە رادەبەدەر بە هۆش و زرینگ بوو و گوایە دوو چەلیش لە تاقی کردنەوەی سەری ساڵ دەر نەچوو بوو، ئیدی لەو ساوە حاڵی بوون کە پیاو لە قوتابخانە هیچ فێر نابێت، ئەوە بوو بە رەزامەندی داك و بابی بەرێزو حورمەتیان لەوێندەر هاتە دەرێ و لە ماڵەوە بە تەنێ مژولی فێربوون و وەدەست هێنانی زانست و زانیاری بوو. ئەو قەناعەتی وا بوو کە هیچ کەسێك لە خەڵکانی گەورە لە قوتابخانە دەرنەچوون، هیچ کەسێك لەوانە دکتۆرو پرۆفیسۆرو خودان بە کالۆریۆس نەبوون.

جەنابیان بە زەوق و شەوقێکی تایبەتیەوە بەرهەم و دانراوەکانی زانایان و تۆرەڤانانی رابردووی موتالا دەفەرموو و گەلێك لەو لەغزو مەتەڵ و نهێنیانەی کە گەورە زانایان نەکاری بوون کەشفی بکەن و بیدۆزنەوە، بە هیمەتی جەنابیانو بە زەبری بیری بەرجەستەو هۆشی لە رادەبەدەریان لە دنیای نەبوونەوە هێنرانە دنیای بوونەوە. ئاغای نواپور کە لە جوملەی لاوانی نوێخوازە، لەو خەڵکانەیە کە سەعدی مامۆستای شاعیران و تۆرەڤانانی ئێرانی دەپەرستن و نابێ بە زێدەرۆیی ئەگەر بڵێین جەنابیان هەوڵ دەدەن کە رەوت و رێبازی ژیانی خۆشیان لەگەڵ شێوازو رێبازی دەورەی نەوەد ساڵەی ژیانی سەعدیدا بسازێنێ. جا ئاغای نواپور چونکە کەسێکی منەوەر بوو، و باوەڕی وا بوو کە دەبێ وەکو سەعدی بەشێکی تەمەن بۆ موتالاو خوێندنەوە و بەشێکی بۆ سەفەرو گەڕان و بەشێکی بۆ شیعر گوتن تەرخان بکرێ، بەلام جەنابیان بە هیچ جۆرێ حەزی لێ نەبوو کە ئاستی فیکری خۆی بۆ ئاستی ئەو دەورو زەمانەی سەعدی بێنێتە خوارێ و دەیان فەرموو: "جیاوازی بەینی سەردەمی ئێستا کە خوای ئەلەتریك فەرمانڕانی هەموو شوێنێك دەکات و دەتوانرێ بە هۆی رادیاسیۆنی ئەلەتریکەوە لە دوورەوە ملیۆنان چێڵ بێ ئەوەی کە پێشتر یان پاشتر یان لەو ساتەدا لەگەڵ جوانەگادا جووت بن ئاوس بکرێن، بە جۆرێ کە رەگەزی نێرو مێی گوێرەکەکەش بزانین، لەگەڵ سەردمی سەعدی دا ئاسمانو رێسمانە. (ئەمە دەقی عیبارەت و قەواڵەی فەرموودەکانی تەلەگرافی هەندەرانی یەکەمی نیسانی ئاغای نواپور بوو

که لەرۆژنامەکانی ئێراندا بڵاوبووەوە). بە کورتی و پوختی ئەوان دەیان فەرموو کە سی ساڵ بۆ خوێندنەوەو موتاڵاو سی ساڵ بو سەفەرو گەشت و سی ساڵ بۆ شیعر گوتن پێویست نییە. بۆ نموونە کاتێ خۆی دەگەڵ سەعدی دا بەراورد دەفەرموو، دەیگوت زانیاری من لەم پایەیەدا یەکجار لە سەعدی زیاترە، چونکە ئەو ئینگلیزی نەدەزانی و ئاگایی و شارەزایی لە کتێبانی (شارستانیەتی کەونارا)و پەیگیری تازە لە فەلسەفەی سوکرات و ریزبەندی ئیمپراتۆرانی ئیسلامو ئامۆژگارییەکانی ئەپیکت-ی فەیلەسوف و بالاَیی نەژادی ئەنگلۆ ساکسون و کتێبانی تازە لە بواری پەروەردەو فێر کردن و "گالتەو گەپ و گەپچیان" و کتێبی پێکەنینۆکی (وغ وغ ساهاب" ئاگای لەمانە نەبووەو حیساب و ئەندازەی نەزانیوەو ناوی ئەلەکتریسەی بەر گوێ نەکەوتبوو ئاگای لە داهێنانی داروین نەبووەو ئەدیسۆنی نەناسیوە.

ئەم عەبدە لاوازەی نووسەری ئەم دێرانە، ناوی ئەدیسۆنی لە پای مینبەری شێخ-ی گەرەکەکەمان کە لە جوملەی زاناو دانا هەرە گەورەکانی ئێرانە، بیستبوو و نەمدەزانی کە چەندی خزمەت بە تیرەی بەشەر کردووە، بەلاَم نێوی داروینم نەژنەوتبوو، بۆیە لە ئاغای نواپورم پرسی ئەمە کێیە؟ جەنابیان فەرمووی کە داروین ئەو داهێنەرە مەزنەیە کە مەکینەیەکی داهێناوە کە دەتوانێ بە ئەلەتریك مەیمونان بکات بە ئینسان.

هەروەها سەبارەت بە سی ساڵ سەفەرو گەشتەکەی سەعدی دەیان فەرموو لەو سەردەمەدا قیتاری تیژ رۆو ئوتۆمبیل و فڕۆکە نەبووە. ئەو رۆژگارە شێخ مشرف بن مصلح الدنیاو الدین عبدالله مەجبور بووە بە کاروان و قەتاری وشتر سەفەر بکات و لەو سی ساڵە سەفەرەدا بیست و نۆ ساڵی بەڕێوە بووە. بەلاَم لە هەنبەر ئەمەدا دەبێ زۆربەی تەمەن بۆ شیعر گوتن و نڤیساری تەرخان بکرێ.

بۆیە ئاغای نواپور پێوە بوو کە بۆ چەند رۆژێك سەفەرێکی ولاَتانی فەرەنگ بکات و پاش گەڕانەوە وەختی خۆی بە نڤیساری رابوێرێ، هەمیشە مکوڕ بوو لەسەر ئەوەی شتانێك لە رۆژنامەکاندا بڵاوبکرێنەوە کە ئەخلاق و ئاکاری کۆمەلاَیەتی چاك بکات، هەڵبەتە ئەم بابەتە لە جۆری خۆیدا بابەتێکی گرینگ بوو، لێ وای بە حاڵی ئەو نووسەرەی کە بخوازێ ئەم هونەرە شەریفە بە ئەوزارو هۆی تورەقی و پێشکەوتنی خۆ بزانێ. ئاغای نواپور کە لە جوملەی لاوانی منەوەرو رۆشنبیرە، قەناعەتیان وابوو کە خۆشبەختانە سیفەتی خراپ لە ئێران نەماوە. کە سانێکی زۆر لە خەڵکانی دوێنێ کە بۆ نموونە لە ریگەی پاچڤەی (شرلوك هلمس و ئارسین لوپن)ەوە ئەمڕۆ دەوڵەمەند بوو بوون. ئاغای نواپور لەم تاقمە نووسەرە زۆر پەست و دڕدۆنگ بوو و هەمیشە بە بەرچاوی خەڵکەوە جنێوی دەدانێ و قسەی پێدەگوتن. دووپاتی دەکەمەوە کە جەنابیان باوەڕی وابوو کە نووسەرانی راستەقینە دەبێ ئامانجی سەرەکیان ریفورم و چاککردنی ئاکارو ئەخلاقی کۆمەلاَیەتی بێ و هیچ ئەرکێك لە دنیادا لەم کارە شەریفە پیرۆزتر نیە، ئەگەر ئێرانیان بخوازن کتێبی نووسەرانی فەرەنگی پاچڤە بکەن دەبێ کتێبی نووسەرانی میناکی ڤیکتۆر هۆگۆ، والتەر سکۆت و گۆستاف لوبون پاچڤە بکەن. چونکە بە وەرگێرانی ئەم کتێبانە، وەرگێڕ تەنیا قازانجی کۆمەلاَیەتی لەبەر چاو دەگرێو هەرگیز قازانجی شەخسی تێدا نییە. بە

خـۆی دەیفـەرموو: "مـن پێـوەم کتـێبی (شارسـتانیە سـەرەتاییەکان)ی کەڵـە نووسـەر گوسـتاف لوبـون، لـە فەرەنسـیەوە بگوازمـەوە بـۆ فارسـی، ئەگەرچـی ئەسـتوورو وێنـەدارو گەورەیـە، بـەڵام بابەتەکانیشـی فـرە نـوێ و جـوانن. بـۆ نموونـە ئـەم غەواسـی دەریـای لێکۆڵینەوەیـە لـە بەشـی مێژووی ئێراندا سەلماندوویەتی کە لە بەرهـەمێن ئـەدەبی پـێش ئیسلامدا تـەنیا دوو کتێبمـان بۆ ماوەتەوە! یـەکێکیان زەند ئاوێستاو ئەویتریان شـانامەیە، ئایا ئـەم بابەتانـە بۆ ئێمـە تازە نییـە؟ دەربارەی والتەر سکوت دەیان فەرموو: "ئەوەی کە هەندێ کـەس دەڵێن والتـەر سکۆت تـەنیا بۆ دانەوەی قەرزەکانی ئەم هەموو رومانەی بەم پێشەکییە درێژانەوە نووسیوە، قسەی قۆڕە، چونکە ئەو هەرگیز قازانج و بەرژەوەندی شەخسی لەبەر چاو نەبووە، مەبەسـتی سـەرەکی ئـەو قازانج و بەرژەوەنـدی کۆمەڵایـەتی بـووە".یـەکێکی دیکـە لـەو نووسـەرانەی کـە ئاقـای نواپـور کـە زۆر دڵبەستەی بەرهەمەکانی بوو، نووسـەری بە نێوبـانگی ئینگلیـز دیکنـز بوو. ئاغـای نواپور کە لـە جوملەی لاوانی نوێخواز ومنەوەر بوو، سەبارەت بەم گەورە پیاوە لێکۆڵینـەوەی قوڵی کـرد بـوو و تەنانـەت ئاگاداری وردە شـتەکانی ژیانیشـی بـوو، بۆ نموونـە بـاش دەیزانـی کـە ئـەم پیـاوە چۆن جلکی لەبەر کردووە، ئاغای نواپور جلو بەرگی بەشـەری زۆر بـەلاوە گـرینگ بـوو و دەیـان فـەرموو کە جلو بەرگ کاریگەرییەکی گرینگی لەسەر دەروون و سایکۆلۆژیا هەیە. هەر میللـەتێك کۆمەڵـە خەسڵەتێکی هەیـە کـە گرنگترینیـان تـەرزی جل پۆشـینیانە، بـە قەناعـەتی جەنابیان شارستانی ترین میللەت و گەلان ئینگلیزەکان و پاشان ئەمریکاییەکان بوون. جل و بـەرگ لـە ژیـانی ئـەم دوو میللەتـەدا دەورێکـی مـەزنی هەیـە، لـە سیسـتەمی ئینگلیـزدا نزیکـەی دووسـەد مـۆدێلی یونیفـۆرم هەیـە. ئینگلیزەکان دەبـێ بـۆ فراڤین ئیسمۆکینگیان (جـۆرە جلێکـی فـەرمی پیاوانەیـە- وەرگێـڕ) لەبەر بێ، دەنا بە عەیبەیەکی کۆمەڵایـەتی دەژمێردرێ. خـەڵکی چینە جیاوازەکانی کۆمـەڵ جلـی جیاوازی خۆیان هەیە، هەر حیزبێك لە ئەوروپادا جلێکـی تایبـەتی بـە خـۆی هەڵبـژاردووە، جلکـی کەسـێکی شۆڕشـگێڕ لـە جلکـی کەسـێکی محافـەزەکار جیایـە. حیزبـی فاشـیزمی ئیتاڵیـا کـە پێشـەواکەی لەسـەردەمی گـەنجی دا کـاری کەشیشـی دەکـرد، چـاویان لـە پێشـەواکەی خۆیـان کـردووەو جلەکـەی ئـەویان بـۆ خـۆ هەڵبـژاردووەو پێشـەوای حیزبـی ناسـیونال سوسـیالیزم کـە لەلاویدا خومچی بووە، لایەنگرەکانی خۆیشی بە هـەمان رەنگـی خـۆی رەنگاندووە." تـۆ تەسـەور بکە کاتێ کە بە پاڵتۆیەکی شیکەوە تەشریف دەبەیـە بـەر دەرگـای یـەکێك لـە سـەرۆك دایـەرەکان، پێشخزمەتەکە چۆن رێزو حورمەتت لێدەنێ. بەڵام ئەگەر پاڵتۆکەت چڵکن و ناشیرین بـێ، یـان بـۆ نموونـە تـەواو بـەدەن چەسـپ نـەبێ و یـان دەسـتدروی خـەیاتێکی ناشـی بـێ، لەسـەدا نـەوەد پێشـخزمەتەکە معامەلەکـەت ناگەیەنێتـە سـەرۆکی دایـەرە، یـان ئەگـەر یەخـەی پاڵتۆکـەت کـەمێك درێـژتر بـێ و هـەڵی بدەیتـەوە، تەسـەور دەکـەی ئـەم پاڵتۆیـە چ حاڵـەتێکی نهێنی ئـامێزت پـێ دەدات؟".

ئێستا، دوای ئەم هـەموو شـەرح و شـرۆڤەیەو بـەم هـەموو باسـەوە کـە دەربـارەی بۆچوونی ئاغـای نواپور، کە لە لاوە منەوەرەکانە، سەبارەت بە پاڵتۆ کرا، خوێنەری ئازیز بە خۆی مەزەندەی ئەوە

لیٚ دەدا کە پاڵتۆکەی ئاغای نواپور تا چ رادەیەك بە گوێرەی سەلیقەو مۆدی رۆژو مۆدێرنیزم دروست کرابوو.
هاوڕێیەکم هەیە زۆر قۆشمەوە حەنەکچییەو بە رێکەوت ئەو شەوە کاتیٚ کە ئاغای نواپور ئەم شتانەی بۆ ئێمە باس دەکرد، لە مەجلیسەکەی ئێمە دابوو، ئەم هاوڕیٚ سوعبەتچییەی من ئاغای نواپوری بە باشی نەدەناسی و هێشتا پەی بە زانستە مادی و مەعنەوەییەکانی ئەو نەبرد بوو، نەیدەزانی کە جەنابیان چەند منەوەرو نوێخواز بوو.
کاتیٚ کە ئاغای نواپور بۆچوونی خۆی سەبارەت بە جلك و بەرگ و کاریگەریی گەورەی جلو بەرگ لەسەر دەروون شەرح دەفەرموو، هاوڕێکەم بە تەوسەوە گوتی: "خۆزیا ئاغای نواپور ئەم زانیاریانەی بنووسیبا تا خەڵکی سوودیان لیٚ وەرگرتبا".
من بەراستی زۆر تەریق بوومەوە، چونکە هەستم کرد ئەگەر ئاغای نواپور، کە لاوێکی منەوەرە، بەم تەوس و توانجەی زانیبا، دۆستایەتی من و ئەم لاوە منەوەرو نوێخوازە بە تەواوەتی تێکدەچوو، بەڵام خۆشبەختانە ئاغای نواپور، قسەکەی ئەوی بە جدی زانی و فەرموویان: "هێشتا کاتی شت نووسینی بەندە نەهاتووە".

*　　　*　　　*

نزیکەی چوار مانگێك بە دیداری ئاغای نواپور، کە لاوێکی منەوەرە، موشەڕەف نەبووم، پاشان بیستم کە بۆ وڵاتانی رۆژاوا سەفەریان کردووە، لە رێگەی روسیاوە بۆ بەرلین و لەندەن و پاریس چوو بوو و لە رێگەی مارسی و بەیروت و بەغداوە بۆ تاران گەڕابوونەوە، هەروەها سەری قودس و بەعلەبەك و ئاکادیمیای دیمەشق و کوفەو بەیلەقان-شی دابوو، پاش گەڕانەوەیان بۆ تاران ئیدی کەس نەیدەبینی، هەموو دۆستان تینووی دیداری بوون و زۆربەیان پێیان وابوو کە سەرقاڵی لێکۆڵینەوە بووەو بەو نزیکانە کتێبێکی گرینگ کە لە دنیای کۆمەڵایەتی ئێران دا کودەتایەکی ئەخلاقی گەورە بەرپا بکات، بڵاو دەکاتەوە. بە راستیش پێشبینی خەڵکەکە نابەجیٚ نەبوو، چونکە زۆربەی ئەم نووسەرانە بە درێژایی رۆژ هەر خەریکن و دەبیٚ بۆ بژێویو بەڕێوەبردنی ژیان زەحمەت بکێشن و رەنج بدەن. بەڵام ئاغای نواپور هیچ پێویستییەکی بەکار کردن نەبوو، کارو کردەوەی سەرەکی ئەو قوڵبوونەوەو لێکۆڵینەوە بوو لە کتێباندا تا بەرهەمێن گرینگ پێشکەش بە میللەت بکەن. جگە لەمە، بەو هەموو زەوقە پڕو فرەیەوە بەو زەخیرە زانستیەوە کە هەموو خەڵکی لە ئاغای نواپوردا دەیان بینی، هەر پێشبینییەکی تریان بکردایە خۆی لە خۆیدا خەتاو گوناح بوو.
بەڵام ئەوەی ئاغای نواپوری منەوەرو رۆشنیر، بەرهەمی هێنا، زۆر لەوە زیاتر بوو کە خەڵکی لێیان چاوەنوار دەکرد. خەڵکی وایان دەزانی کە ئاغای نواپور کتێبێکی ئەستور بڵاو دەکاتەوەو بەو کتێبە کودەتایەك لە کۆمەڵگەی ئێراندا بەرپا دەکات، هەواڵی سەرکەوتنی ئەوان لەوە زیاتر بوو کە خەڵکی چاوەڕوانیان دەکرد. ئاغای نواپور تەنیا یەك گوتاریان رەش کردەوەو ئەم تاقە گوتارە بە جۆریٚ لە کۆمەڵگەدا دەنگی دایەوە کە هەموو جەماوەری خەڵکی هێنایە جۆش و

خرۆش. ئەم گوتارەی جەنابیان لە رۆژنامەی ((ریفۆرمی کۆمەڵایەتی))دا کە تێکرای بەڕێوەبەرو هاوکارەکانی لە نوێخوازان و منەوەرانن، بڵاوبووەوە. جا لەبەر ئەوەی بەندەی لاواز، نووسەری ئەم دێڕانە، ئەو پایەومایەیەم نیە کە لە راپەڕینێن زانستی و ئەدەبی و کۆمەڵایەتی، ئاگادار بم، پێویستم بە خوێندنەوەی رۆژنامانیش نابێ. رۆژنامە هی لاوانی منەوەرو رۆشنبیر و نوێخوازانە. کەسانێك کە پایەو ئاستی زانستی تێگەیشتنی ئەو گوتارە گرینگ و ئەو زنجیرە گوتارە گرینگترانەی موریس لبلان و میشل زڤاگویان نەبێ، چ سوودێکی لێ وەردەگرن؟ بە تایبەتی رۆژنامەی ((ریفۆرمی کۆمەڵایەتی)) کە لەوێدا نوچەێن خاریجی کە هەندێ جار بەندە پێویستی دەبێ چاپ نەکرێت و هەر هەموو ستونەکانی بە وتارێن ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی رەش بکرێتەوە، ئەم رۆژنامەیە بەرابەری لاوانی ئێرانی دێتە ژماردن، زۆربەی وتارەکانی، لە کتێبانی کۆنەوە پاچڤە کراون، بە کورتی بەندە چ دەستێکم لە رۆژنامەدا نەبوو. لێ رۆژێ چوومە کتێبخانەیەك. کۆمەڵێك زاناو تورەڤان لەوێ بوون و باسی گوتارەکەی ئاغای نواپور هاتە ئارا. ئاغای زانا قەهستانی و تۆرەڤان جەوشەقانی کە هەر یەکەیان کۆڵەکەیەکی پایەداری جیهانی زانست و ئەدەبن و زانیاری مەعقول و مەنقول و شارەزایی فرەی ئەوان لە ئەحادیس و ئەخبارو فیعهو ئوسوڵ و هەیئەت و نجوم و زمان و مێژوو و رەچەڵەك و لۆژیك و حیکمەت و فەلسەفە، پێویستی بەباس و ستایش نیە، هاوڕێ دەگەڵ کۆمەڵێکی دی لە نووسەرانی پێشەنگ، تەشریفیان لەوێ بوو و هەریەکەیان شرۆڤەیەکی تێرو تەسەلی سوودەکانی ئەم جۆرە لاوانەو بە تایبەتی ئەم چەشنە گوتارە کە سوودی گشتییان تێدایە، فەرموو. ئاغای قەهستانی کە پەیوەندییەکی تایبەتی دەگەڵ "کۆڕی زانستی ئێران"دا هەیەو مودەتێکیش سەرۆکایەتی ئەم کۆڕە پیرۆزەیان لە ئەستۆدا بوو، واهیان فەرموو: "من ئەسڵەن‌و ئەبەدەن‌و موتڵەقەن‌و بە هیچ کلۆجێ نامەوێ فەزڵ‌و کەماڵ و زانست و ئەدەبی ئەم ئەهلی ئیمانە بخەمە بەر ئێرادو رەخنە، نا نەخێر هەرگیز، بە پێچەوانەوە بوونی ئەم جۆرە لاوانەیە کە ئینسان وا لێدەکات ئومێدی بە ئایندەی ئەم میللەتەو ئەم ئاوو خاکە هەبێت، بەڵام ئەم ئاغایانە تۆزێك لاون و هەندێ جار زێدە توندڕەوی دەکەن، خۆ ئەگەر پێشتر هاتبوایە کن بەندە، لەوە بوو هەندێ یارمەتیم دابوایە. زێدەباری ئەمەی کە هەندێ وشەی عامیانەو رەمەکی لە گوتارەکەی خۆیدا بەکار هێناوە کە بە قەناعەتی من لە فەساحەت و بەلاغەت دوورە، هەندێ ئێرادی دیکەش لە وتارەکەی دەگیرێ. بۆ نموونە بەندە زۆرم پێ سەیرە کە بۆچی بە هیچ جۆرێ ناوی پۆستینی نەبرد بوو، هەر نەبێ ئەمەش جلکێکی پێشینانی ئێمەیەو هێشتاش گەلێك لە ئێمەمانان کە دەچینەوە بۆ ماڵ و لە ژێر کورسی دا دادەنیشین، چاك دەزانین کە ئەگەر پۆستین نەبێ، حاڵمان پەشێو دەبێ".

ئاغای ئەدیب جەوشەقانی کە پایەی زانستی جەنابیان لە سەرووی وەسفەوەیە، فەرموویان: "فەرمایشەکانی جەنابی ئاغا دروستە. ئێمە هەقمان بە کەسایەتی ئەوەوە نییە، بەڵام گوتارەکەی هەڵبەتە بە سوودە. لێ رەخنەکانی جەناب عالیش بەجێ و بتەون، بەندە بە تایبەتی جەخت لەسەر ئەو قسانەی لەمەر پۆستین فەرمووتان دەکەمەوە، بۆ نموونە بەندە یەك لەباری خۆم نوێژ بە کراس و بێجامەوە دەکەم، بەڵام دوعای سمات، دوای نوێژ ئەگەر پۆستینم نەبووایە، بۆ

نەدەکرا. باوەڕ دەفەرمووی کە هەر هەموو ئەم باسانە نووسەرانی پێشڕەوی ئێمە لە کتێبە کۆنەکاندا بە دوورو درێژی باسیان کردووە، بەڵام وەکو فەرمووت، لاوان وا باشترە کە هەندێ جار بچنەوە سەر ئەم کتێبە کۆنانە".

حەزەراتی ئاغایان، باسێکی زۆریان لەمەڕ ئەم بابەتە فەرموو، بەڵام زۆربەی باسەکانیان بە زمانێ بوو کە لە کێشی تێگەیشتن و دەرکی بەندەی حەقیر، نووسەری ئەم دێڕانەدا نەبوو. بۆ نموونە یەکێك لەو ئاغایانە هەمیشە لە ناوەندی قساندا کۆمەڵێکی رستەی عەرەبی دەفەرموو و باسی فەسخ و رەسخ و مەسخ و نەسخی دەکرد کە بۆ بەندە زمانی جنۆکە بوو. منی بەندەی لاواز لە نیازو مەبەست و بیروبۆچوونی ئاغایان ئەمە حاڵی بووم کە هەر هەموویان بە گوتارەکەی ئاغای نواپور، لاوی منەوەرو نوێخواز، خۆشحاڵ بوون، ئیرادی گەورەیان تەنیا ئەمە بوو کە بۆچی ئەم لاوە نەچووەتەوە سەر کتێبانی کۆن.

هەر هەمان رۆژ بۆ شەوەکەی لە ماڵی ئاغای (رادبان)دا کە لە نووسەرانی نمرە یەکی ئێرانە، بە خزمەتی جماعەتێك لە تۆرەڤان و ئەدیبان گەییشتم (هەر بۆ ئاگاداری عەرزتانی دەکەم کە خوێنەرانی ئازیزی من وا تەسەور نەفەرموون کە بەندەی حەقیر ئەهلی کۆڕو مەجلیسی زاناو ئەدیبانمو تێکەڵی وانم، نەخێر، بەندە ئەو شەوە بەم مەبەستە چووبوومە خزمەتی ئاغای رادبان کە تکای لێ بکەم بەڵکو سەرۆکی دایەرەکەی ئەم بەندەیە، راسپێرێ کە بۆ سەری ساڵ هیمەتێ بکات و زیادە مووچەیەکم بۆ دابین بکات یان لایەنی کەم بۆ دایەرەیەکی دیکەم بگوازنەوە)).

ئاغای رادبان لە بواری ئەدەبیات و لێکۆڵینەوەو پەیگیری مێژوویی دا خاوەنی بەرهەمێکی فرەیە و تا ئێستاش چەندین جار لە کۆڕە گشتییەکاندا خوتبەی پڕ سوودی بەقازانجی جەماوەری خەڵکی داوەو بێگومان بە یەکێك لە بلیمەتانی ئەم سەردەمە دەژمێردرێن. جەنابیان بە تەواوەتی دژی شارستانیەت و فەرهەنگی سامی و عەرەبی و بەرهەمی ئەو قۆناغە بووەو پێیان وایە مەملەکەتی ئێران کە بێشکەی نەژادی ئارياییە پێویستە خۆی لە پۆخڵەواتی شارستانیەتی عەرەب رزگار بکات و خووی پێشینانی خۆی بکات بە پیشە. بیروبۆچوونەکانی ئەم جوامێرە کارێکی گەورەی لە جەماوەری منەوەرانی ئێران کردووەو دەبێ دان بەوەدا بنرێ کە لە ئەنجامی هەوڵ و کۆششی ئاغای رادبانەوە لایەنگرانی ئەم بیروباوەڕە گەورەترین رابوونی کۆمەڵایەتی لە ئێراندا پێك دەهێنن. بە رێکەوت لە ماڵی ئەم گەورە پیاوەش باسی گوتارەکەی ئاغای نواپور هاتە ئاراوە، هەر پیا هەڵدان و ستایش بوو کە لە هەموو لایەکەوە حەواڵەی دانەری بەڕێز دەکرا. بە تایبەتی یەکێك لەو لاوانەی کە تازە هاتبووە کۆڕی نووسەرانەوە، گوتی: "ئێمە ئارياییین، ئێران نیشتمانی هەژی ئێمەیە. زۆر ئاشکرایە کە شارستانیەتی ئێمە لە شارستانیەتی ئەوروپاییەوە نزیکترە تا لە شارستانیەتی عەرەب. ئێمە پێویستە لە هەموو شتێکدا چاو لە ئەوروپاییانی ئاريا نەژاد بکەین. لەم رووەوە لەگەڵ نووسینەکەی نواپور دام، هەر چەندە من لە حوزوری ئەواندا هیچ نیم".یەکێکی تر لەو نووسەرانەی کە تا ئێستا چەندین گۆڤاری دامەزراند بوو و لە هەر یەکێکیاندا لایەنگری بیروباوەڕێکی جیاواز بوو، فەرموویان: "لەم رووەوە بەندەش بە تەواوەتی دەگەڵ گوتارەکەی ئاغای نواپوردام و رەنگە تا ئێستا وتارێکی ئەوەندە بە سوودو

باش لە ئێراندا بڵاونەبووبێتەوە، بەڵام من تێناگەم کە بۆچی جەنابیان ئەو هەموو وشە ناباوە عەرەبییەی بەکار هێناوە، لە کاتێکدا دەیانتوانی گەلێك لەو وشانە بە فارسی پەتی بنووسن".
(مەبەست لە فارسی پەتی و خالیسە ئەگەر خوا نەخواستە هەندێ لە خوێنەران تێی نەگەن، هەمان فارسییە کە ئاغای ڕێزدار قسەیان پێ دەفەرموو). نزیکەی دوو دانە سەعات سەبارەت بە گوتارەکەی ئاغای نواپور لەو مەجلیسەدا قسەکراو بە ڕاستی حەزم چووە ئەوەی کە ئەم ڕۆژنامە گرینگە پەیدا بکەم، بچمە لای یەکێك لەو ئاغایانەی کە لەم شتانە تێ دەگەن‌و بەیارمەتی ئەو ئەم ڕۆژنامەیە بخوێنمەوە. بۆ نەگبەتی دوو ڕۆژ بەسەر بڵاوبوونەوەی ئەم گوتارەدا تێپەڕی و ئیدی ئەم بەندەی بێ توانایە، نووسەری ئەم دێڕانە، بە تەواوەتی لە بیرم کرد. بەڕێکەوت شەوێ چوو بوومە وەعزی شێخی گەرەکەکەمان‌و لەوێش جەنابیان سەبارەت بە گوتارەکەی ئاغای نواپور وەعزیان فەرموو.
بە داخەوەم چونکە بەندەی حەقیر لە دووری مینبەرەکەی ئاغای شێخ ڕۆنیشتبووم و گوێم لە هەموو فەرمایشتەکانی جەنابیان وەکو خۆی نەدەبوو، نەمتوانی لە مەبەستە بەرزو باڵاکانیان حاڵی ببم، واتە بۆ بەندەی حەقیر مەیسەر نەبوو، مەعلوم نەبوو کە ئاغاو شوێنکەوتووەکانی لەگەڵ ئەم گوتارەو نووسەرەکەیدا بوون یان دژی بوون. لەوە دەچوو ئاغا هەم لە ناڵ بدات و هەم لە بزمار. وا دیارە چونکە پەیان بە بایەخ و گرنگی گوتارەکە لە نێو کۆمەڵگەدا بردبوو، نەیاندەویست دژایەتی بکەن و بەمە ژمارەیەك لە لایەنگرانی خۆیان بتارێنن. بۆ نموونە ئەگەر چی ژێراوژێرو نا ڕاستەوخۆ کۆمەڵە ئاماژەیەکیان بۆ نا پایەداری دنیای دون، و زەرورەتی گوێ نەدان بە جلو بەرگ کە شتێکی ڕواڵەتییە، و زەرورەتی بایەخدان‌و خۆ تەرخانکردن بۆ چاککردنی نوێژو ڕۆژوو تەقواو ترس لە خوا، فەرموو، و جوانکاری لە جل و بەرگ و ڕواڵەتیان بە یەکێك لە هۆکارەکانی لوت بەرزی و فڕناخی و دووری لە خوا دەزانی و دەیانگوت: "ئەو سۆفیە خوانەناسەی کە – لیس فی جبتی سوی الله–ی دەگوت: لوتبەرزی و فەرناخی و گومرایی لە فرە جوانی جبەکەیدا بوو". شیعری مامۆستای شیعر سەعدیان بەنموونە دەهێنایەوە کە فەرموویەتی پیاوێك کە هیچ جل و بەرگێکی لەبەر نەبێ، باشترە لە جلو بەرگێك کە پیاوی تیا نەبێ، وێڕای ئەمەش ستایش و ئافەرینی بێ پایانی نووسەری لاوی زاناو ڕۆشنبیرو منەوەری گوتارەکەیان دەکرد و بیروباوەڕەکانیان بە شایستەی توژینەوە و وردکردنەوەو ڕامان دەزانی.
پاشان لێبڕام کە هەر دەبێ و بە هەر شێوەیەکە ئەم گوتارە بە دەست بێنم و بە یارمەتی نەفەرێکی زانا لە نێوەڕۆکەکەی حاڵی ببم، بەڵام ڕۆژنامەی ناڤبری دوا دانەی فرۆشرا بوو، بە تایبەتی چوومە خزمەتی ئاغای بەڕێوەبەر، فەرموویان کە بە تایبەتی لەبەر بایەخی وتارەکەی ئاغای نواپور سێ سەد نووسخەمان لێ چاپ کردبوو، کەچی هەر هەمووی فرۆشراو تاقە یەك نوسخەشی نەماوە.
ماوەیەك بوری و لە هەموو شوێنێك لە هەوڵی ئەوەدا بووم کە ئەم گوتارە بە دەست بێنم و بیخوێنمەوە، چەند ڕۆژێك لەمە پێش هەروا چووم بۆ یەکێك لە موغازەکانی لالەزار تا قوماشێك بۆ پاڵتۆ بکڕم، لە موغازەدارەکەم پرسی: "قوماشی تازە چیتان هەیە؟".

لە وەڵاما گوتی: "چما تۆ گوتارەکەی ئاغای (نواپور)ت لە رۆژنامەی "ریفۆرمی کۆمەڵایەتی) نەخوێندووەتەوە؟ ئەم گوتارە بە ئەندازەیەك گرینگ بوو کە چاپ کراوەتەوە، قوماشی پاڵتۆ لەو قوماشانەی کە ئێمە دەیان هێنین، باشتر نییە. بەشی پاڵتۆیەکمان لەو قۆماشە پێشکەش بە خودی ئاغای نواپور کردووە".

ماوەیەك لەسەر نرخەکەی سەواو مامەڵەمان کرد، پاشان سەد سوێندی خوارد کە لە نرخی مایەکارییەکەشی، لەبەر خاتری من کە مشتەرییەکی ئازیزی ئەوم، بڕێك زەرەر دەکا، سێ مەترو نیو قوماشم کڕی و موغازەدارەکە لە گەڵ قوماشەکەدا نوسخەیەکی لە سەفتە رۆژنامەیەك کە لەوێ دانرا بوو، بە خۆڕایی دامێ.

بە پەلەپەل چوومەوە بۆ ماڵێ و بەر لەوەی تەماشای قوماشی پاڵتۆکە بکەم، هەوەڵجار ویستم ئەم گوتارە گرینگە کە ئەوەندە عەوداڵی بووم بخوێنمەوە، لە راستیدا بە وەدەستهێنانی رۆژنامەکە پتر لە کڕینی قوماشەکە خۆشحاڵ بووم، بەڵام چی بێ لە ئێوە نهێنی؟ گوتارەکە هەمان مەبەست و نێوەڕۆکی لە خۆ گرتبوو کە پێشتر بۆی باس کردبووم و هاوڕێکەم بە تەوسەوە هانی دا بوو کە بە نووسین بڵاوی بکاتەوە. بەڵام لە رۆژنامەکەدا هیچ نیشانەیەکم نەبینی کە نیشانەی دووبارە چاپکردنەوەی بێ. بەڵام لە ژێر گوتارەکەدا ریکلامێکی هەمان موغازەدارم، کە قوماشەکەی لە نرخی مایەکاری کەمتر بە من فرۆشت بوو بینی، هەڵبەتە بەندەی بێ توانای نووسەری ئەم دێڕانە ئەوەندەم گومان لە خەڵکی نیە کە وا خەیاڵ بکەم، لاوێکی خانەدانو سەلارو سەنگینی میناکی ئاغای نواپور کە لە لاوانی منەوەرو رۆشنبیرە، پێشکەشی لەم پیاوە دەوڵەمەندەی کە بە سەری حەزرەتی موسا قەسەم قوماشەکەی بە نرخی مایەکاری کەمتر بە من فرۆشتبوو، لە بارتەقای نووسینی ئەم وتارە گرینگەدا، وەرگرتبێ.

تاران — دی ١٣١٣ (١٩٣٤)

# کورتە مێژوویەکی ژوورەکەم

ئاخریەکەی خۆم لەو گەڕەکە پیسە رزگار کرد. چیتر ناچار نیم هەموو شەوێ خۆرش و شلەی باینجان بخۆم، لە دەست دادە خۆش قەدەمو پێ بەودمەکان، باجی و فاتمە سوڵتان قوتار بووم. ئیدی کەس ناوێرێ، بەیانیان کاتێ کە من نووستووم، لە پشت دەرگاکەوە بەخشەخش گسکان بدات و تەپوتۆزی بەینی خشتەکان بە ژوورەکەی مندا بکات. ئیدی کەس ناتوانێ دەستکاری کتێبەکانم بکات، لە دەستی کاسەی سەهۆڵاویش رزگار بووم. هەر کاتێ حەزم لێ بێ گرامافۆنەکەم کۆك دەکەم و گوێ لە مۆزیقا دەگرم. ئیدی تا ساڵی دوای مەرگی پورەقزی مۆزیقا لە ماڵەکەی مندا قەدەغە نییە. قەتڵ و قیامەتیش رابێ دەتوانم مۆزیقا لێبدەم. ئیدی شیڤی من پەیوەندی بەمەوە نیە کە: "با بابە تەشریف بێنێتەوە" چیتر رۆژانی هەینی دەنگی گریانی منداڵەکەی پورەقزی خەبەرم ناکاتەوە. لە گەڕەکێکی سەرووی شاردا، لە ماڵە ئەرمەنییەك دوو ژوورم بەکرێ گرتووە، لێرەدا ئەم دوو ژوورەم بە دڵی خۆم رازاندووەتەوە. کتێبەکانم بە کەیفی دڵی خۆم لەبەر دەستی خۆمدا داناوە. مێزێك و چەند کورسییەکم هەیە، پەردەکانی ژوورەکەم دەستچنن، مافوری جوانم نیە، بەڵام زیاتر حەزم لەم زیلۆیە، زیلۆکەم تازەیە، بەڵام مافورەکانی ماڵی خۆمان هی دوو سەد ساڵ لەوەپێشە، ئەم زیلۆیەم بە سەلیقەی خۆم کڕیوە. دڵنیام کە یەك کەسی دەردەداری لەسەر نەمردووە، ژوورێکی کارکردن و ژوورێکی خەوم هەیە. هەموو هەڤاڵەکانم بەغیلیم پێ دەبەن. ئەمڕۆ یەکێکیان بۆ ئێرە هاتبوو، حەزی لە ژوورەکانم کرد. پێم دەڵێت: "من لە دەست پورە پیرەکەمو دایکم بێ تاقەت بووم. ئێرە ژووری دیکەی بەتاڵی لێ نییە؟" گوتم: "با ئەو ژوورەی تەنیشتەوە چۆڵە! لێ نازانم بە کرێی دەدەن یان نا. تا ئێستا نەم دیتووە دەرکەی ئەم ژوورە بکرێتەوە. ئەمڕۆ لای عەسر لە خاوەن ماڵەکەم خا هاکوپیان دەپرسم و شەوێ کە یەکدی دەبینین خەبەرت دەدەمێ..."

* * *

"خات هاکوپیان، هاوڕێیەکم حەزی لە ماڵەکەی ئێوە کردووە. دەتوانی ژوورێکی بەکرێ بدەیتێ؟"

– نە، ژوورم نییە.

– چۆن؟ ئەدی ئەم ژوورەی تەنیشت ژوورەکەی من چۆڵ نیە؟

– با، بەڵام ئەم ژوورە بە هیچ کەسێك بەکرێ نادەم.

– سەیرم پێدێ، چونکە کە دەبینم ئارداشسی کوڕتان هەر کاتێ لە شول دێتەوە، ناچێتە ئەم ژوورە.

– نەهەقت نیە، بەلام ئەم ژوورە هی کوڕە گەورەکەم، ئارشاویر بوو، لەوەتای ئەو مردووە، دڵم نایەت بە کەسێکی غەوارەی بەکرێ بدەم، ژوورێکی باشیشە. حەزەکەی بیدینی.
خات هاکوپیان هەستاو من دوای کەوتم. ئەم خانمە نزیکەی چل و پێنج ساڵێك دەبێت، هەڵبەتە لە کۆنا لە جوملەی جوان و خشیکان بووە، بەلام ئێستا زۆر تێك شکاوە، لە ئێران هاتووەتە دنیا، لیٚ لاوی خۆی لە روسیادا بەسەر بردووە! بە باشی بە روسی قسان دەکات، لە من باشتر روسی بەڵەدە، بیست و پێنج ساڵە، یانی لەوەتای شووی کردووە، لە ئێران دەژی. فارسییەکی چاکیش دەئاخویٚ، بەلام فۆنەتیکەکەی ئەرمەنیە. بە روسی قسان دەگەڵ مندا دەکات. خات هاکوپیان لە ژنە وریاو زرینگەکانی دنیایە، کە هەڤدە ساڵ لەوە پێش مێردەکەی مردووە، ئیدی هەر خۆی ژیانی هەردوو کوڕەکەی (ئارشاویرو ئارداشس)ی بەڕێوەبردووە. هەر خۆی ناردونیە قوتابخانەو زمانی روسی فێرکردوون. بە قسەکانیا وا دیارە کە کوڕە گەورەکەی، ئارشاویری، کە ئێستا مردووە، زیاتر خۆش ویستووە. بە قسەکانیا دیارە کە ئەو لەگەڵ بابیا دوو لەتی یەك سێو بوون، وێنەیەکیم لە ژوورەکەدا بینی. دەموچاوێکی خڕی هەڵکفاوی شەهوانی هەبوو، ئاشاوێر لە رووی روخسار، ئەندام، ئاکار، و لە هەموو روویەکەوە لە بابی چووە.
خات هاکوپیان کلیلەکەی هێنا، دەرکی ژوورەکەی کردەوە، خۆی لە پێشا وەژوور کەوت. ئەوجا رێگەی منیشی دا بڕێکی زۆر کاغەزو کتێبی بەرگ تێنەگیراویان لەسەر مێزێکی کەنار پەنجەرەکە دانا بوو. کۆمەڵێك کەرەستەو تفاقی جزوبەندو بەرگ تێگرتنی لیٚ بوو کە تەپوتۆزیان نیشتبووە سەر. لەم بەرەوە تەختێك هەبوو قالیچەیەکی بەسەرەوە بوو، لەوبەری مێزەکەوە سوپایەکی چکۆلەی کانزایی هەبوو. جگە لەم کەلوپەل و شمەکانە، دەرودیوارەکان ئەگەر چی تۆزاوی بوون، بەلام ژوورەکە پاك و خاوێن دەهاتە بەرچاو، شتێك لێرەدا نەبوو کە سەرنجی بەشەر رابکێشێت.
خات هاکوپیان کە تا ئێستا لەبەر دەرگاکە وەستا بوو هاتە پێشتریٚو بە قامکی ئاماژەی بۆ دیوارەکە کردو گوتی: "تەمەشا ئەمە جێی پەنجە خوێناویەکانی کوڕەکەمە، هێشتا دڵم نەهاتووە کە ئەم پەڵانە بسڕمەوە. لەوساوە تانهۆ ئەم شتانەم خاوێن نەکردووەتەوە، تەمەشا ئەم گەردو تۆزە، هەموو جارێك لە ساڵیادی لە دایك بوونیا چەپکە گوڵێك دەخەمە سەر مێزەکە، لە تەنیشت وێنەکەیەوە. وشك دەبێتەوەو لە جێی خۆی دەمێنێتەوە".
ئەوجا دەستەسڕەکەی لە بەرکی دەرهێنا، دەستی بەگریان کرد. ئەوەی راستی بیٚ دڵم پێی سوتا. ئیدی حاڵی بووم کە هۆی پیری ئەم ژنە، بێگومان ئەم مەسەلەیە بووە. ژێر باڵیم گرت و هێنامە ژوورەکەی خۆی و کەوتمە دڵدانەوەی و گوتم: "خانم، بەڕاستی بەلات بەسەر هاتووە، من نەمدەزانی ئەم چەند جارەش کە ئارداشس لێرە بوو. ئەویش باسی ئەم بابەتەی بۆ نەکردوم، چما کوڕەکەت خۆی کوشتووە؟".
خات هاکوپیان، لەسەر کورسییەکەی من، لەبەر سۆپاکە دانیشت و گوتی: "نە، خۆی نەکوشتووە. هەرچیەك بیٚ من ژنم و دەگریم، بە گریان دڵم کەمیٚ هێور دەبێتەوە. بەلام هاوار بە ماڵم بۆ ئارداشس، تۆ نازانی چەند ناڕەحەتە، دەزانی ویژدانی ئاسودە نیە، هێشتاش هەر وا دەزانیٚ کە مردنی ئارشاویر ئەنجامی درێغی ئەو بووە".

که مەسەلەی مردنی ئارشاویرم لەخات هاکوپیان پرسی، بە درێژی بەمجۆرەی بۆ گێڕامەوە.
"هەر چییەك بوو لەم ژوورەی تۆدا روویدا، ئەم ژووره دیرۆکێکی هەیە، نزیکەی چوار ساڵێك لەمەپێش رۆژێك ژن و شوویەك هاتن و ئەم دوو ژوورەیان بەکرێ گرت. ئەو پیاوە ئاڵمانی بوو، لەودیلانەی جەنگ بوو کە لە روسیادا مابووەوەو پاشان بۆ ئێران هاتبوو. تۆ لە پەهلەوی بووی؟ کاتێ خۆی لە جێی ئەم شوێنەی کە ئێستا باخ و بولوارە، ئوتێلێك هەبوو، هی پیاوێکی روسی بوو. ئەم ژنە کیژی ئەو بوو، من نازانم لە کوێ سۆراخی ماڵی منیان زانی بوو. پێدەچوو چونکە روسی بەڵەد بوون، ویستبێتیان لە ماڵێکا بن کە روسی بزانن، رۆژێك دانیشتبووین، دەمەو عەسر بوو، سەیرمان کرد خاشولتس وەژوورکەوت. ژنێکی گەنج، کەڵەگەت، چاوڕەش و قژ زەرد بوو. زۆر خشیك نەبوو، بەڵام شتێکی هەبوو کە پیاوانی رادەکێشا، دەزانی هەمیشە بە کەیف و بە دەماغ و تەڕو بڕو خاوێن بوو. پێی گوتم کە مێردەکەم لە پەهلەوی ئەندازیار بووەو دەمێ بوو لەوێ کاری دەکرد. ماوەیەك لەمەپێش لەسەر بیناکەوە شەلمانێك لە ژێر پێی دەرچووەو کەوتووەتە خوارەوە. لەوساوە تا ئێستا تووشی نەخۆشیەکی سەیر بووەو ماوەیەکە چاوی کەم حوکم بووەو ئێستا هەر بە جارێ نابینا بووەو هیچ نابینێ. هێناومانە تا لە تاران مالیجەی بکەین. ئەو بەو جۆرە باسی کوێر بوونی مێردەکەی گێڕایەوە، بەڵام پاشان لە خەڵکانی ترەوە شتی دیکەمان بیست، بە هەر حاڵ هۆیە راستەقینەکەی هەر ئاشکرا نەبوو، من هیچ بیانویەکم نەبوو و گوتم باشترە، کە ژن و مێردێك بێنە ئەم دوو ژوورە، سەریەشەکەی بۆ من کەمترە، غافڵ لەمەی کە ئەم ژن و مێردە دەبنە بەڵای گیانی من. کاتی کەخات شۆلتس دەیویست بڕوات، دنیا تاریك بوو بوو، من ئارشاویرم، کە لە ژوورەکەی خۆی مژولی کارکردن بوو، گاز کردو گوتم: خانم بە رێکە، نەبا لەسەر پلیکانەکان بکەوێ، وەختێ کە ئارشاویر هاتەوە سەرێ، گوتی: دایکە، ئەم ژنە کێ بوو؟ گوتم: ئەمە ژنی کابرایەکی ئاڵمانیە، نێوی خات شولتسە، ئەم دوو ژوورەم بەکرێ داوە بە خۆی و مێردەکەی.
"رۆژی دواتر مستەر شوڵتس و خێزانەکەی هاتن، من ژوورەکانم -یانی ئەم دوو ژوورە- پێ نیشان دان، خۆیان سیپاڵ و تفاقیان نەبوو، من شتومەك و تفاقم دانێ، ژوورەکەم جوان رازاندبووەوە، لە ئێستای باشتر بوو، مستەر شولتس کۆرە بوو، بەڵام کوێرییەکی تایبەتی هەبوو. بردبوویانە لای هەموو دکتۆرە بەنێوبانگەکان. هەر هەموویان یەك قسەیان کردبوو کە هیچ عەیبێك لە چاوتا نابینین، نەخۆشی دەمارە، تەنیا دکتۆرانی پسپۆڕی پاریس و بەرلین و ڤێنا دەتوانن چارەی بکەن".
کاتی خاتو هاکوپیان گوتی دکتۆرەکان وایان بە مەسڵەحەت زانیوە مستەر شوڵتس خۆی پیشانی دکتۆرانی پاریس و بەرلین و ڤینا بدات، لە دڵی خۆدا بیرم لەوە کردەوە کە بێگومان کوێرییەکەی هۆیەکی جیاواز لەوەی کە خات هاکوپیان بۆ منی گێڕایەوە هەبووەو ویستم باسی ئەو حیکایەتانەی لێ بپرسم کە لە خەڵکانی دیکەی بیست بوون. بەڵام خات هاکوپیان هەر قسەی دەکردو زۆریش خەمین بوو:

"ئـەم پیـاوە رۆژ بـە رۆژ چـاوی خراتـر دەبـوو، لـەم دواییانـەدا هـەر هیچـی نـەدەبینی. بـەردەوام دەیگـوت و دەیگوتـەوە: ئەگـەر لـە ئـەڵمانیا بـام ئـەم بەڵایـەم بەسـەر نـەدەهات، بـەڵام دکتۆرەکـان ئەوەشیان گوتبوو کە لەگینـە رۆژێك لـە ناکاودا چاوی خـۆ بـەخۆ بینـا ببێتـەوە. دوای ماوەیـەك پارەیـان تـەواو بـوو، کۆلـۆنی ئاڵمـانی بـڕە یارمەتیـەکی دەدان، بـەڵام بەمـە بـەڕێوە نەدەچـوون، ژنەکەی گولدۆزیو نەخش و نیگارێکی باشی دەزانی، لە رێگەی پایەدارێکەوە کە لە پەهلـەوی دا دەیناسی، چوو بووە ماڵە دەوڵەمەندەکانەوەو کیـژەکانی فێـری قولاپـدۆزیو خـەیاتیو تۆڕچینی دەکردنو لەم رێیـەوە تـا رادایـەك ژیانیـان بـەڕێوە دەچـوو. مسـتەر شولتسـی مێردی بـە زۆری بـە تـەنیا بـوو. لەبـەر ئـەم پەنجەرەیـەداو ئەگـەر هـاوین بوایـە لـە هەیوانەکـەدا رۆدەنیشـتو بـیری دەکردەوە.

خوا دەزانێ بیری لە چ دەکردەوە؟ تا ئەو رۆژەی ئەم مەسەلەیە رووی دا، دڵم پێی دەسووتا، وەکو کـوڕی خـۆم خۆشـم دەویسـت، ئـاخر دەزانـی، ئەمـە دەردێکـی زۆرگرانـە، بەشـەر چـاوی هـەبێ و دوایی کوێر ببێ، بەستەزمانە لە بەیانییەوە تا ئێواری لەم شوێنەدا دادەنشیت و بیری دەکردەوە، بە جۆرێ لـە فکـران رادەچوو، ئەگـەر هەنـدێ جار کەسـێك هاتبـا ژووری و قسـەی لەگـەڵ کردبا، ئاگـای لـێ نـەدەبوو. دوا نیـوەڕوان کـە (ئارداشـس)ی کـوڕم لـە قوتابخانـە دەهاتـەوە، دەچـوو بـۆ ژوورەکەی ئەوو لەوێ کتێبی بۆ دەخوێندەوە. شـولتس زۆری حـەز لـە کتێبـەکانی دۆستوفسـکی دەکـرد. ئـەو کتێبـە ئاڵمانیانـەی کـە پاچڤەی روسـی دا کـرا بـوون، دەکـڕینو ئارداشـسو هەنـدێ جـاریش، هەڵبەتـە بـە دەگمـەن ژنەکـەی بۆیـان دەخوێنـدەوە، ژنەکـەی زۆر خـۆش دەویسـت، ژن ومێردێکـی دلۆڤـان و میهرەبـان بـوون. بـۆ نموونـە بـیرم دێ کـە مسـتەر شـولتس قـژێکی زەردی هەبوو، هەندێ جار لەسەر نان خواردن چەپکێك لە قژەکـەی بەسـەر هەنیـەی دا بـەر دەبـووەوە. بـە خـۆی نـەی دەبینی. ژنەکـەی هێنـدە بـەمیهرەبانی دەسـتی دەبـرد و بـە قامکـەکانی قژەکـەی سـەر هەنیەی لادەبرد هەر مەپرسە، مستەر شولتس لەم حاڵەدا دەستی ژنەکـەی مـاچ دەکـرد. کـاتێ کە نیگای شووەکەی دەکرد، لە تۆ وایە دەیەوێ بە چاوانی بیلاوێنێ و نەوازشی بکات، بە جۆرێ کە ئەو بەو کوێریە بتوانێ هەستی پێ بکات، (مستەر شولتس)ش ژنەکـەی زۆر خـۆش دەویسـت، بـۆ نموونـە حـەزی نـەدەکرد کـە ژنەکـەی بـە خـۆڕایی بـە دیـار ئـەوەوە دانیشـێت، زۆر جـار زۆری لـە هاوسەرەکەی دەکرد کە بە خۆڕایی لە ماڵەوە دامەنیشە، بچۆ بۆ سینەما، بڕۆ بۆ سەما، بڕۆ، لێرە بە تەنێ دامەنیشە، وێڕای ئەمەش زۆری غیرەت لە ژنەکـەی دەکـردو دەسـت ودڵـی بـۆی دەلـەرزی. ئەگەر شەو بـەبێ پـرس درەنـگ تـر لـە سـەعات هەشـت بـۆ مـاڵ بهاتبایـەوە، شـپرزەو دەسـتە پاچـە دەبوو، بـێ قـەراری دەکـرد، هـەر سـا نـا سـاتێ دەسـت بـە دیـوار خـۆی دەگەیانـدە بـەر هەیوانەکـە، لەسەر قاڵدرمەکان دەوەستاو بێ ئەوەی چ شتێك بدینێ نیگای دەبڕییـە تاریکییەکـە، لەجێیەکـەی دەجوڵا، هەر کەسێکی دەبینی لێی دەپرسی: خێزانەکەی منت نەبینی؟ هەمدیس دەسـت بـە دیـوار خـۆی دەگەیانـدەوە ژووری. ئیـدی ئەمـە حـاڵی بـوو تـا ژنەکـەی دەهاتـەوە. جـاری واش دەبـوو کـە خات شـولتس دەگـەڵ ئارشـاوێری کـوڕە گـەورەم یـان ئارداسـش دا بـۆ سینەمـا دەچـوو. لـێ خـات

شولتس نەیدەویست بە تەنێ بچێتە کۆڕی سەما. دەیگوت: من ئامادە نیم بەبێ تۆ بچمە کۆڕی سەما، لەگەڵ خەڵکی دیکەشدا حەزناکەم.

"نوئێلی ساڵی ١٩٣١بوو، هەموو کۆبووبووینەوەو بە تەرزی ئەڵمانی جەژنمان گرتبوو. درەختی کاژمان رازاندبووەوەو لەم شوێنەدا کە تۆ مێزی نووسینەکەت لێ داناوە، لەسەر تەپڵەکێکمان دانابوو. من کتێبێکی ئەڵمانی بە روسی کراوم بە مستەر شولتس بەخشی بوو. هەمووومان جەژنانەمان بۆ یەکتر کڕی بوو و هی هەر یەکێکمان بەجیا لەسەر مێزێك دانا بوو. گۆرانیمان گوتو شەرابمان خواردەوە. لە کۆتایی شەودا هەموو شەکەت و ماندوو لێی خەوتین. لای بەیانی بوو، یانی هێشتا دنیا تاریك بوو، سەیرم کرد لە ژوورەکەی (مستەر شولتس)ەوە دەنگ دێت، تا من هەستام، سەیرم کرد دەنگە دەنگەکە زیادی کرد، مستەر شولتس بانگی دەکرد: "کاچا، کاچا!" کاچا، نێوی ژنەکەی بوو. من هەراسانو شپرزە بەرەو ڕاڕەوەکە دەرپەڕیم، سەیرم کرد کوڕەکانمو (خات شولتس) لە ڕاڕەوەکەدان، هەر کە من دەرگای ژوورەکەمم کردەوە بینیم کە خات شولتس خۆی بە ژووری مێردەکەیدا کرد. وامزانی مستەر شولتس سەکتەی گرتووە. بەدوای خات شولتس دا وەژوورکەوتم. مستەر شولتس کاتێ کە گوێی لە دەنگی من بوو، گوتی: خانم من ئێستا چاوم هەبوو ئەستێرەکانی ئاسمانم بینی، ئەوجا لە ژنەکەی پرسی: تۆ لە کوێ بووی؟".

"من چاوەنۆڕی وەڵامی (خات شولتس)م نەکرد. لە ژوورەکە وەدەرکەوتم دیتم کە ئارداشس و ئارشاوێر بە دزداشەی خەوەوە لە پاڵ یەکا وەستاون. هەردووکیان ڕەنگیان هەڵبزڕکا بوو، ئارداشس بە برا گەورەکەی گوت: "باشە چ کارێکی لە ژوورەکەی تۆدا هەبوو"؟

خات هاکوپیان لێرەدا ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی: "هەر بەڵایەك بەسەر بەشەرا دێت، لە سۆنگەی ژنانی خراپەوەیە".

من تەنیا یەك وشەم گوت: "عەجەب!"

"بەڵام ڕۆژی دوایی مستەر شولتس هەمدیس کوێرە بووەوە، بردیان بۆ لای دکتۆری ئاڵمانی سەفارەت. گوتی: بەڵێ، ئێمە گوتبوومان کە هیچ عەیبێك لە بونیادی چاویا نییە، تووشی نەخۆشی عەسەبی بووەو لەگینە ڕۆژێ لە ڕۆژان چاوەکانی بکرێنەوە. لە ئەڵمانیادا بە ئاسانی چارەسەری دەکەن. بەڵام ئەو ڕۆژە، نێوەڕۆ لەسەر فراڤین وەزع و حاڵێکی غەریب لە ماڵی ئێمەدا بەرپا بوو، ئارداشس پەست و بێ تاقەت بوو. قسەی لەگەڵ کەسدا نەدەکرد، ئارشاوێر هەر نەهاتە سەر سفرەکەش، بیانووی ئەمە بوو کە چەند کتێبێکی تازەیان بۆ هێناوم دەبێ تا عەسر بەرگیان تێ بگرمو تەواویان بکەمو بیاندەمەوە بە خاوەنی. مستەر شولتس حاڵی خراپ بوو، نەیدەویست نان بخوات. خات شولتس ئەمجارەیان قژی مێردەکەی کە بەسەر هەنیەدیدا بەربوو بووەوە، لانەبردو ڕێك نەخستەوە. تەنیا یەك جار خاولیەکی دەم و زار پاك کردنەوەی دایە دەستی تا دەم و لێوی خاوێن بکاتەوە، کەچی جاران خات شولتس بە خۆی ئەم کارەی دەکرد. تەنیامنی داماو بێ گوناح بووم، لە هەموو شتێ خراتر ئەمەیە کە ئێمەمانان کە دایکین وا دەزانین کە لە هەموو کەسێك نزیکترین لە منداڵەکانمانەوە، لە کاتێکا کە وا نیە، دایك لە هەموو کەس بە

منالەکانی نامۆترە. مندالآن هەزار شت بە هەڤالەکانیان دەڵێن کە یەك شتی بە دایکیان نالێن. نە ئارشاوێر، نە ئارداشس تاقە یەك وشەیان بە من نەگوت کە چ شتێك لە بەینیاندا روویداوە، دەتخوا بیهێنە بەرچاوی خۆت، کە لە حاڵی وادا بەشەر چی لێ دێ. ئەو رۆژە، پاش نیوەڕۆ هەر چەند لەگەڵ ئارداشس دا هەوڵم دا نەیدەویست چیتر کتێب بۆ مستەر شولتس بخوێنێتەوە. دەیگوت: بۆچی ژنەکەی شەوێك نەبووە بەلایەوە بمێنێ و سەر گەرمی بکات؟ راستیشی دەکرد، خۆ ئێمە کوچکی گەرمتر لە ئاگر نەبووین. نزیکەی یەك ساڵ بوو کە خات شولتس هیچ هەقێکی بەسەر مێردەکەیەوە نەبوو. راستە کە ژیانی شووەکەی بەڕێوەدەبرد، بەڵام دەستی بە هیچەوە نەدەدا، جاری وادەبوو کە شووەکەی سێ دانە رۆژان لەبەر نەخۆشی و بێتاقەتی لە جێدا دەکەوت و بە زەحمەت لە ژوورەوە دەهاتە دەرێ. ژنەکەی نە شەوەنخونی بە دیارەوە دەکردو نە بۆ دەرو ژوورکردن دەستی دەگرت، کەچی زۆر جار بە دوو سەعات و سێ سەعات لە ژوورەکەی ئاشاوێری کوڕم دادەنیشت و قسەی دەگەڵ دەکردو تەمەشای کارکردنی ئەوی دەکرد. جارێکیان ئارشاویر بۆ چەند رۆژێك نەخۆش کەوت، تای دەهاتێ، خات شولتس بەردەوام بە دیاریەوە بوو، خواردنەکەی دەدایە، ئەم دیوو ئەو دیوی دەکرد، ئاگاداری خواردنەکەی دەکرد، جارێکیان بەگژ مندا هات کە بۆچی بەخەمی کوڕەکەتەوە نیت.

پەست بووم، پێم گوت: تکات لێدەکەم کە خۆت مەکە بە دایەنی دلۆڤانتر لە دایك.. لەگەڵ ئەمەشدا، نەمدەتوانی هیچ بەدخەیاڵیەك دەربارەی ئەم ژنە بکەم دەنا نەم دەهێشت لەم ماڵە دا بمێنێ.

" لەو شەوەوە ئیدی ئارداشس نەچوو بە ماڵی مستەرشولنس دا، بەڵام لەلایەکی ترەوە هیچ قسەیەکیشمان لێ سادر نەبوو کە ئەو ژن و مێردە عادز بکات. دەزانی، بەقەولی خودی ئەڵمانەکان کەش و هەوای ماڵەکەی ئێمە قورس و بە بریسکەو هەورە تریشقە ئاوس بوو. تێ دەگەی دەمەوێ چ بڵێم، هیچ دڕ دۆنگیەك لەماڵەکەندا نەبوو، هەموو قسەیان پکێڤە دەکرد، کەس لە کەس زویر نەبوو، ئەگەر غەریبەیەك هاتبا ماڵەکەمان هەستی بە هیچ شتێکی نا ئاسایی نەدەکرد. بەرۆژەوە من بە خۆم دەچووم ژوورەکەی ( مستەر شولس)م کۆ دەکردەوە، بە زۆری لێرەدا دانیشتبوو، چونکە دنیا سارد بووو سۆپاکەش لێرەدا بوو (مەدام بە دەستی ئیشارەتی کرد) بە رواڵەت هیچ نەگۆڕا بوو. بەڵام کەش و هەوا بە بریسکەو هەورە تریشقە ئاوس بوو. من هەستم دەکرد کە شتێك دەقەومێ، ئەو هەورە تریشقەیە دەبێ بتەقێتەوە.

" هەفتەیەك بەسەر رووداوەکانی ئەو شەوەدا بوری، تا سەری ساڵ هات. بیرتە شەوی یەکی ساڵی ١٩٣٢ دنیا زۆر سارد بوو، لەو ژوورەوە کە بەرۆژ نانمان لێ دەخوارد، هاتینە ئەم ژوورە. چونکە ئێرە گەرمترو کپ تر بوو. من بۆ ئەوەی ئەم جووتە برایەو ئەم ژن و مێردە لەو وەزع و حاڵەی کە گیرۆدەی بوو بوون، و لە هەموو کەس زیاتر زەرەری بە من دەگەیی، رزگار بکەم بە پارەی خۆم جەژنێکی تێروتەسەلم فەراهەم کرد. قازێکم بۆ شەوێ لێنابوو. دەزانی ئەڵمانەکان چۆنی قاز لێ دەنەن. قازەکە بە بێ رۆن و بەنەعنا و ئاویشەنەوە لە مەنجەڵ دەنێن تا لە رۆنەکەی خۆیدا سوربێتەوە. ئەگەر ئەوان ئەم قازە لە رۆژی لە دایك بوونی مەسیح دا دەخۆن، بەڵام بۆ

ئێمە هیچ فەرقێکی نەبوو. من ئەمەم مەبەست بوو کە خواردنێکی خۆش بێتە سەر خوانەکە، شەرابێکی باشم ئامادەکرد بوو، بیرەی ئەڵمانیم کڕی بوو، بە پێی توانا داب‌و نەریت‌و ئە تەکێتی ئەڵمانیم رەچاو کرد بوو، بۆ نموونە پرتەقاڵ‌و لالەنگی‌و گویزو بوندق‌و زەردەلوی وشك کراوە مشەبوو. مناڵەکان جلکی رەشیان لەبەر بوو، (مستەر شولتس)ش وەکو ئەوان. ژنەکەی جلکێکی سپی جوانی لەبەر کردبوو. ئەو شەوە بە ڕاستی جوان بوو بوو، چەند بەکرەیەکی باشی گرامافۆنم لە کوڕی خوشکەکەم وەرگرتبوو، هەموو شتێکی شادی بەخشم لە ماڵەوە ئامادەکرد بوو. هەموو شتێك، بەڵام دەزانیت ئەو شتەی کە بۆ کۆڕی دۆستایەتی پێویستە، دڵی پاك، دڵی خاڵی لە کەرب و کینەیە، نەمدەتوانی ئەوە فەراهەم بکەم. هەرچم کرد کۆڕەکەمان گەرم نەبوو‌و نەبوو. شەرابمان خواردەوە، خات شولتس رۆمانسێکی روسی خوێندەوە، بە کۆمەڵ گۆرانیمان گوت، گرامافۆنمان لێدا. تەنانەت (مستەر شولتس)ش کەمێك خەیاڵ بوو، هەموو پێدەکەنین، بەڵام کەش و هەوای ژوورەکەمان بە هەورە تریشقە ئاوس بوو، من لەو شەوو رۆژەدا هەستم بەمە دەکرد، بەڵام نەم دەزانی، ئەگەر بمزانیبایە، بە هەر نرخێ بووە پێشم لێ دەگرت. بوو بە نزیکەی سەعات نۆ. تۆ کە لە هەندەران boویت و دەزانیت کە بۆ شەوی سەری ساڵ، سەعات نۆ هێشتا هەوەڵی شەوە، بەڵام هەموو ماندوو بوو بوون.

"لە پڕ مستەر شولتس لە ژنەکەی پرسی: کاچا ماندوو بووی؟"

– نە، ماندوو نەبووم، بەڵام چ بکەم؟

– کاچا هەستە بچو بۆ سەما، بڕۆ بۆ "ئەستوریا" بڕۆ بۆ بەرلینیرهۆف.

– ئەوە تۆ چ دەڵێی، من بە تەنێ هەستم بچم بۆ ئەوێ. چ بکەم؟

"مستەر شولتس، هەر بەو دەقەوە کە لەسەر کورسیەکەی رۆنیشتبوو، بێ ئەوەی کەمترین شوێنەوار بەسەر چاویەوە دەربکەوێ، گوتی: کێ دەڵێ بە تەنێ بڕۆی، من تکا لە ئاغای ئارشاوێر دەکەم کە لەگەڵتا بێت، ئاغای ئەرشاوێر، هەڵبەتە تۆ قسەم لە عاردی نادەی.

"ئەرداشس، لە ناکاو هەستاو لە ژوورەکە وەدەرکەوت، بەڵام بەر لەوەی کاچا چ قسەیەك بکات، ئارشاوێر گوتی: من ئامادەم ئەگەر خانم مەیلی لێ بێ، هەڵبەتە لەگەڵیا دەچم". و "بێ ئەوەی کە چاوەڕوانی مستەر شولتس یان ژنەکەی ببێ، پێکەکەی هەڵدا، لە جێی خۆی هەستاو گوتی: من دەڕۆم خۆم دەگۆڕم. هەر ئەوەندەی بڵێی یەك و دوو کاچاش هەستا، دەموچاوی شووەکەی ماچ کرد، پاڵتۆ رەشەکەی لەبەر کرد، شاڵێکی بەسەریا داو رۆیی. من‌و مستەر شولتس بە تەنێ لە ژوورەکەدا ماینەوە". گوتم: مستەر شولتس دەتەوێ تۆزێك کتێبت بۆ بخوێنمەوە.

– مەمنونیش دەبم، ئەم کتێبەی ئارتورشنیسلرم تازە کریوە، چیرۆکێکی تیایە بە ناونیشانی "ژنی زانایەك" ئەگەر زەحمەت نییە ئەوەم بۆ بخوێنەوە.

"و دەستم بە خوێندنەوە کرد. لە نێوەی چیرۆکەکەدا (ئارداشس)ش هاتەوە ژووری و لەسەر کورسیەك دانیشت. دەوروبەری سەعات دە بوو، بە چاو ئیشارەتم کردێ کە تۆزێکی بۆ بخوێنێتەوە، بەڵام حەزی لە خوێندنەوە نەبوو، جێی خۆیەتی ئێستا باسی بابەت و نێوەڕۆکی ئەم چیرۆکەت بۆ بگێڕمەوە. چونکە پێم وایە بۆ تێگەییشتنی مەبەستەکە پێویستە. مستەر

شولتس ئەم کتێبەی بە ڕێکەوت و لە خۆڕا نەکڕی بوو، بۆیە حەزی لێ بوو لەو دەمەدا ئەم چیرۆکە بخوێنرێتەوە: پیاوێك دوای حەوت ساڵان ماشوقەکەی دەبینێ. ئەمە ژنی کابرایەکی پرۆفیسۆر، کابرایەکی زانا بووەو ئەم پیاوە لە ماڵی ئەو پرۆفیسۆرەدا ژووری هەبووەو شاگردو قوتابی ئەو بووە. حەوت ساڵ لەوە پێش ڕۆژێ کە ئەم پیاوە دەگەڵ ماشوقەکەیدا خەریکی ئەشقبازی بووە، لە حاڵێکا کە ماشوقەکەی، یانی ژنی پرۆفیسۆری گۆڕین، لەبەر پێی ئەودا کەوتووەو سەری لە باوەشیا پەنهان بووە، کابرای پرۆفیسۆر دەرگای ژوورەکە دەکاتەوە کە بەو حاڵەوە دەیانبینێ، بە ئەسپایی دەرگاکە دادەخاتەوەو دەگەڕێتەوە. ئەم کابرایە لە شەرمی ئەوەدا کە مامۆستاکەی بەو حاڵەوە دیتوویەتی یەکسەر جانتاکەی هەڵدەگرێتو لەو ماڵە وەدەردەکەوێ، ئەمڕۆکە پاش حەوت ساڵ دەیەوێ گوێی لە ماشوقەکەی بێ کە پاش ئەو کەتنە چی ڕووی داوە. بەڵام هیچ شتێك ڕووی نەداوە، چونکە ماشوقەکەی هەرگیز بەوەی نەزانیوە کە پرۆفیسۆر بەو حاڵەوە دیتویەتیو پرۆفیسۆریش لە زەرفی ئەم حەوت ساڵەدا هەرگیز ئەم مەسەلەیەی بە ڕووی ژنەکەیدا نەداوەتەوە.من لەسەر خوێندنەوە بەردەوام بووم تا گەییمە ئەم ڕستانە! کەواتە ئەم هیچ کاتێك ئەمەی بە ڕووی ژنەکەیدا نەداوەتەوە، ئەم ژنە نازانێت و هیچ کاتێ نەیزانیوە کە شووەکەی ئەوی لەبەر پێی ئاشقەکەیدا دیتوە، ئەو ڕۆژە لەبەر دەرگاکەوە، بە ئەسپایی، و بە جۆرێ کە کەس پێ نەزانێ گەڕاوەتەوە.. پاشان دوای چەندین سەعات بۆ ماڵ هاتووەتەوەو هیچ قسەیەکی لەگەڵ ئەودا (ژنەکەی) لەو بارەیەوە نەکردووە. کە گەییمە ئێرە، لە پڕ مستەر شولتس توڕە بوو و گوتی: نا، ئەمە مەحاڵە، بەسە، مەخوێنەوە.

"سەیرم پێهات و گوتم: چ شتێك مەحاڵە؟

– چۆن دەبێ پیاوێك حەوت دانە ساڵی خشت هەرزەیی ژنەکەی بدینێ و خۆی لە گێلی بدات. ئیتر مەیخوێنەوە، لێم گەڕە با ئیسراحەت بکەم... من ئەمەم بە فرسەت زانی، هەستام. چونکە وام هاتە خەیاڵ لە کاتی خوێندنەوەکەدا لە ماڵەکەدا گوێم لە دەنگی پێی کەسێك بوو.. بە ئارداشسم گوت: تۆ لێرەبەو ئەگەر مستەر شولتس ویستی باقی چیرۆکەکە یان چیرۆکێکی تری بۆ وەخێنە تا من هەندێ "گروگ" دروست بکەم.

ئیدی چی لە نێوان ئارداشس و مستەر شولتس دا ڕوویدا، چ قسەو باسێکیان پێکەوە کرد، ئەمانە بە دروستی نازانم، بەڵام پاشان پاشماوەی حاڵ و مەسەلەکەم زانی، دیار بوو کاتێ کە خات شولتس و ئارشاویر چوو بوونە دەرێ، ئارداشس لە دواوە تاقیبی کردبوون، دوایی دیتبوونی کە ئەسڵەن بۆ کۆڕی سەما نەچوو بوون و یەکڕاست بۆ ماڵ گەڕابوونەوە. ئەو زووتر هاتبووەوە ماڵێ و لە هەیوانەکەداو ڕوو لە کۆڵانەکە چاودێریان دەکات. کە بینی بووی هاتوونەتەوە ماڵێ، ئیدی دڵی ڕەحەت بوو بوو هەنگێ هاتبووەوەو لە ژوورەکەدا چاوەڕوان بوو بوو کە خات شولتس و ئارشاویرش بێن، بەڵام ئەوان چوو بوونە ژوورەکەی ئارشاویر.

گوایە دوای ئارداشس بە مستەر شولتسی گوتبوو کە ئەوان لەو ژوورەن، من لە موبەقەکە بووم و خەریك بووم "گروك"م دروست دەکرد، ئاڵمانییەکان، بە تایبەتی لە شەوی سەری ساڵدا زۆریان حەز لەم شەرابەیە (گروك). شەرابی سوڕو تۆزی ڕوم و قەندو دارچین و مێخەك تێکەڵ دەکەن و

دەیکولێنن و دەیخۆن، من مژۆل بووم کە بینیم لە پڕ دەنگی مستەر شولتس بەرز بووەوە. دەرگاکان دران بە یەکاو ئەو بە غاردان وەدەر کەوت، هەوەڵجار چووە ژوورەکەی خۆی بەلاّم نەك دەست بە دیوار، نەخێر، رای دەکرد، من ئاگام لە هیچ نەبوو، لە پڕ دەنگێکی ترسناکم هاتە گویٚ، شولتس لە ژوورەکەی ئارشاویردا سیٚ گوللەی یەك لە دوای یەکی تەقاند بوو، کاتیٚ چوومە ژوورەکە، دیتم کوڕەکەم و خات شولتس لەسەر عاردی کەوتوون. چاوانی مستەر شولتس کرابوونەوەو دەی بینی، بەلاّم کە چاوی بە من کەوت دەستی خستە سەر چاوەکانی تا ئەم وەزعیەتە نەبینیٚ".

* * *

شەویٚ کە دەمویست بۆ لای هاوڕێکانم بڕۆم، چاوێکم بە ناو ژوورەکەدا گێڕا، هەمان ئەو دوو چەپکە گوڵە وشکەوە بووە لە ویٚ بوو. هاوڕێکەم هات، پرسی ئاخۆ کاری ژوورەکە تەواو بووە، من دەگەڵ خاوەن ماڵەکەدا قسەم لێکردووە یان نا؟ گوتم: "لەو ماڵەی ئێمەدا ژووری بە تاڵ نییە، یەك ژووری بەتاڵ هەیە، بەلاّم خاوەن ماڵەکە بەکریٚی نادات".

تاران – ئازەر ١٣١٣ ((١٩٣٤))

## قوربانی

دارو درەختان تازە چرۆیان کردبوو، دویێ شەو تەپ و نمێکی کردبوو، لێ ئەمڕۆ دنیا ساف و گەش بوو. خوسرەو لە سەر چرپاکەی کەوتبوو. دوای سێ دانە مانگ نەخۆشی و لە جێدا کەوتن ئەمڕۆ بۆ یەکەمجار دەرگای ژوورەکەی کردبووەوە.

دەم و چاوی ساف و چاوانی خومارو مات دەینواند. لەبەر پەنجەرەکەداو دەنێو حەوشەدا سێ دانە مریشك بە دەم چینە کردنەوەو بە لاقان خۆڵی باخچەکەیان هەڵدەدایەوە. مریشك و کەڵەشێرێك چوونە قەراخ حەوزەکە، ئاویان دەخواردەوەو دوای قووتدانی هەر دڵۆپە ئاوێك سەریان بۆ لای یەکدی وەردەسوڕاندو تەماشای یەکتریان دەکرد.

من لە قەراخ چرپاکەی خوسرەو رۆنیشتبووم. دەمێ بوو قەبوڵی نەدەکرد کەس بدینێ، بەڵام من هەموو هەفتەیەك یەك دوو جاران بۆ هەواڵپرسین دەچوومە ماڵیان. قسەم دەگەڵ دایکی دەکرد، ئەمڕۆکە نازانم چۆن بوو کە قبوڵی کرد بچمە لای، گوتم: "شوکر حاڵت باشترە، هەمووی دوو سێ رۆژی ترەو ئیدی هەڵدەستیتەوە".

چونکە هیچ وەڵامێکی نەدامەوە، لەسەری رۆییشتم: من تا ئێستا چەندین جار هاتوومە هەواڵپرسینی تۆ، هەمیشە هەواڵم لە دایکت پرسیوی."

گوتی: "بەڵێ، دەزانم". ئەوجا بەرەو حەوشەکە تلێکی دا، پێدەچوو قسەکانم ماندووی بکەن.

پشیلەیەکی رەش هاتبووە دیار حەوزەکەو بە چنگەکانی ئاوەکەی دەشڵەقاندو دەیوست ماسیەکان خڕ بکاتەوەو ئەوجا پڕیان بداتێ و رایان رفێنێ.

خوسرەو هەمدیس بەرەو لای من تلی داو گوتی: "بۆچی کتێبێکی تازەم بۆ نایەنی؟ دکتۆر لێی قەدەغە کردووم کە کتێب بخوێنمەوە، گوایە ئەم پیاوە شتێتی لە گەڵە".

– تۆش نابێ لەزێ بکەی، ئارام بگرە هەمووی چەند رۆژێکی ترەو چاك دەبیتەوە.

خوسرەو کۆکە گرتی و پاش ئەوەی لەگەنەکەی لە دەمی نزیك کردەوە، گوتی: "تۆ دڵنیایت؟"

– بەڵێ، زۆر دڵنیام، چونکە متمانەم بەم دکتۆرە هەیە، خۆ هەر بە رەنگ و رووتیشا دیارە، ئەمڕۆ رەنگت ساف و دەمو چاوت گەشە.

خوسرەو، وەکو یەکێك بە زەحمەت بتوانێ بیر بکاتەوە، برۆکانی وێك هێنانەوە.

– لە کەیەوە چارەسەری سیلیان دۆزیوەتەوە؟

گوتم: "سەبارەت بە تۆ سیل لە گۆڕێ نییە، تۆ سەرمات بووەو تەنیا لەبەر پارێز نەکردن تووشی سینەپاڵوو ژان و برکی بە درێژا بووی".

– "بۆچی بە خۆڕایی گەنگەشە بکەین؟ من تاقەتم نییە"

هەمدیس رووی لێ وەرگێڕام.

بە ئێسکە دەرپەڕیوەکانی گۆنای دا دیار بوو کە مردن قوربانیەکی تازەی پەیدا کردبوو. بەڵام ئەم بیرە بە هیچ کلۆجێ لە مێشکی مندا جێی نەدەبووەوە، ئاخر چۆن دەبێ خوسرەو بمرێ؟ چۆن من باوەڕ بکەم؟ چەند گەشبین بوو، چەندی هیواو خۆزی لە دڵدا بوو. لە ناکاودا بیری مەرگ بە

شێوەیەکی سامناك لەبەر چاوما بەرجەستە بوو. بەهەر حاڵ خۆ سیل تەنیا هۆیەکەو هیچی دی. لەوەیە خوسرەو بە کۆڵانێکا بڕوات و پارچە خشتێکی پێ بکەوێ و بیکوژێت، کە بیرۆکەیەکی ناخۆشە. بە دەنم لەرزی، خوسرەو بەم لاویە، بەم هەموو بیرەوە، بەم هەموو هێڤی و خۆزیایەوە. خوسرەو بەم هەموو هەستە ناسکەوە دەبێ بمرێ. هەر هەموو بوونی ئەم لاوە فەوت دەبێ. هیچ شوێنەوارێکی نامێنێ، روحی دەمێنێ؟! بەڵێ، ئەم روحە دەمبەستێکە بۆ پیاوانی سەرکێش تا بە گەوجێتی بمێننەوە، ئەوەی راستی بێ خوسرەو لەوەتای کە لە جێگەدا کەوتبوو، یەکجار گۆڕا بوو. جاران لەگەڵ دۆست و برادەراندا چەند گەش و رووخۆش بوو، سوعبەت و گاڵتەی دەکرد، بە هەمووانی رادەبوارد، هەموو کەس بە کەسێکی سەرڤە سەرڤە و ناجدیان دەزانی، بەڵام درەنگانی شەو کە بە دوو قۆڵی پێکڤە رۆدەنیشتین و هێدی هێدی پێکە شەرابمان هەڵدەداو بێ ئەوەی زار هەڵێنین، زەق زەق تەمەشای یەکترمان دەکردو ئەو پەڕە کاغەزێك یا پاکەتی جگەرەکەی خۆی ورد ورد دەکرد، یان کاتێ کە پاش شەراب خواردنەوە گوێمان لە بەکرەی گرامافۆن دەگرت، لەم جۆرە کاتانەدا خوسرەوی راستەقینە دەردەکەوت. من دەمزانی کە ئەو چییە، ئەوسا دەردەکەوت کە ئەم بەشەرە بێ موبالات و خەمساردو بێ فیکرە، لە راستیا چەند شەیداو تامەزرۆ پڕ هێڤی بوو، ئەو خەڵکی بە شایستەی ئەوە نەدەزانی کە قسەی جدیان دەگەڵ بکرێ. هەر جارێ کە یەکێك لە دۆستەکانمان ژنی دێنا، ئەو دەیگوت: "فلان کەس بووە بە خاوەن ژن، سەنگین و رەنگین بووە، وا چاکە چەند بەردێکی دیکە بخاتە گیرفانی تا سەنگین تر ببێ".

لە کۆتایی شەوان دا کاتێ کە کەسی ترمان لەگەڵ دا نەدەما، هەمان بابەتی بە جۆرێکی دی دووبارە دەکردەوە. "تۆ بیر بکەوە پیاو ژن بێ، بۆ نموونە کێ، کیژی فلان بازرگان، یا فیسار سەرۆك دایەرە، یان فلان وەکیل، تۆ پێت وایە لەم رەمەکیانە باشترن؟ بهێنە بەرچاوت کە پاش نان خواردن بیانەوێ قرقێنە لێ بدەن، یان شەوێ بیانەوێ گوێ لە بەکرەی زینەتول ملوك بگرن، ئیدی بۆ هەتاهەتایە ژیانت لەبەر چاو دەکەوێ".

سەرباری ئەم تەوس و توانجانەو وێڕای ئەم بێزارییەش، من دەمزانی کە بە خۆیشی چەند ئاشقە ژنە... جارێك لە هەندەران ئاشقێنی دەگەڵ کێژێکدا کردبوو... ئەم ئاشقێنیەی هەزار جارو بە هەزار و یەك شێوە بۆ من گێڕا بووەوە.. جا ئێستا ئەم خوسرەوە دەبێ بمرێت!

لە کاتێکا کە من زەق زەق دەمڕوانیە ئاوی سەوزباوی حەوزەکە، دیتم پاچڤەیەکی فەرەنسی شوێنهاوەری لە ژێر بالیفەکەی دەرهێناو کەمێکی هەڵدایەوە.

کاتێ کە خوا حافیزیم لە خوسرەو کردو دەمویست لە ژوورەکەی وەدەرکەوم، سەیرم کرد دایکی لە ژوورەکەی تەنیشتەوە کز کۆڵەی کردووەو لەسەر عاردی دانیشتووەو عەباکەی لەسەرو چاوی توند کردووە، گوێ لە قسەکانی ئێمە دەگرێت، هەر کە منی بینی، لە جێی خۆی هەستا، من سڵاوم لێکرد، هەنگێ بۆ ژوورێکی دوورتری بردم و کەوتە دەردە دڵ.

– ئاغا، خوسرەو تەنیا بە گوێی تۆ دەکات، کارێ بکە کە تۆزێ بە رێنوێنییەکانی دکتۆر بکات، ئێمە چەندی پێ دەڵێین، گوێی لێ نیە.

گوتم: "خانم، دەبێ زۆر مەدارای خوسرەو بکەن، زۆر هەستیارو دڵناسکە، تا دەتوانن بە دڵی ئەم بجوڵێنەوە".

- ئاغا، رەنگە بە خۆت بزانی، لەم ماڵەدا هیچ کەسێك بێ دڵی ئەو ناکات. لەم ماڵەدا کەس قسە لە قسەی ئەو ناکات. رێی کەسمان نادات بچینە ژوورەکەشی.

دەمویست شتێکی دیکەش عەرزی با خزمە تتان بکەم. نزیکەی یەك مانگە کە کیژێك هەموو رۆژێ بۆ ئێرە دێ، من نایناسم، لێ خوشکەکانی ئێژن کە کچی ماڵێکی باشە. رای سپاردووم کە هەر کاتێ هات رێی نەدەم –ئاخر ئەمە باش نییە. جا ئەم بەدبەختە، بە هەر زمانێ کە دەمانەوێ ئەمەی تێ بگەیەنین، دەستبەردار نابێ و نابێ. هەموو رۆژێ ئەم حەلانە دێتە هەواڵپرسی. تۆ کارێکی وەها بکە کە خوسرەو بە خۆی پێی بێژێ کە ئیتر نەیەت.

لێم پرسی: "نێوی فروغ نیە؟".

- با، راستت گەرەکە، ئێمە شەرم دەکەین.

من لە فکران راچووم و ئیدی کەمتر ئاگام لە قسەکانی داکی خوسرەو ما، کە پڕ لە دەردە دڵ و سکاڵا بوون لەم خوو ورەفتارە مەنگەی کوڕەکەی و هەروەها لەمەش دڵگران بوو کە بۆچی خوسرەو تا ئێستا دەربارەی ئەم کیژە قسەی دەگەڵ ئەودا نەکردووە. لە قسەکانیا ئەمە بە دیاردەکەوت کە ئەگەر بە دەستی من بوایە، دەمێ بوو رێگەی ئەم ماڵەم لێ گرتبوو، لێ حەیف و مەخابن خوشکەکانی نەیان دەهێشت. کە میهرومەحەبەتی ئەم دایکەم دەرهەق بە خوسرەو لە خەیاڵی خۆدا بەرجەستە کرد، قسەیەکی خوسرەوم بیر کەوتەوە کە رۆژێك بە منی گوت: "ئایا دەشێت میهرو مەحەبەتیش لە دنیادا ببێ بە مایەی دەردی سەری بنیادەم؟".

ئەوسا گوتی: "دکتۆر دوێنێ دەیگوت کە شوکر بۆ خوا خوسرەو حاڵی باشتر بووە، ئەگەر زۆر پارێز نەکات و ئەم نەخۆشیە ساڵێکی تر لەم کاتانەدا دووبارە هەڵبداتەوە، یەکجار ترسناکە. ئاغا هەوڵێکی لەگەڵ بدە کە ئیتر ئەوەندە کتێبان نەخوێنێتەوە".

لە شووشەی پەنجەرەکەوە دیتم کە خوسرەو لە ژوورەکەی وەدەر کەوتووەو لەسەر قاڵدرمەکانی نێو حەوشە رۆنیشتووە.

دایکی کورسیەکی بۆ برد. منیش چوومە نێو حەوشەو لەلایەوە وەستام، پێی گوتم: "چەند هەتاوێکی خۆشە!".

دایکی گوتی: "خوسرەو خان، خۆت باش داپۆشیایە". خوسرەو رووی کردە من و گوتی: "بەڕاستی بە هار گیانی تازە وەبەر هەموو کەسێکدا دەکات، ئەم شمشادانەی ماڵی ئێمە تا دوێنێ رەش و بێ رەنگ بوون، ئەمڕۆ لە پڕ گەڵاکانیان سەوزو ناسك بوون. تەنانەت ئەوانەشی کە لە پایزی بوری دا مردوون، هەنووکە دووبارە دەژێنەوە".

لە راستیدا ئەمە حاڵەتی ئاسایی خوسرەو بوو. حەزی لێ بوو هزرو خولیای شاعیرانەی خۆی بە شێوەیەکی سادەو هەمە فام دەر بڕێ. لێ هەندێ جار هەمان ئەم بیرانەی بە تەوسبازی و تەنزەوە دەگوت. ئێستا سیماو دەموچاوی حاڵەتێکی ترسناکی لە خۆ گرتبوو. ئایا لە پشت

دەرگاکەوە گوێی لە قسەکانی ئێمە بوو بوو؟ وام دێتە بەرچاو کە ئەم خوسرەوەش لە مەرگ دەترسێت، ئەم خوسرەوەی کە تا ئێستا دوو جاران هەوڵی خوکوژی دا بوو و نەمرد بوو.

پاڵتۆیەکی خوری بە شانیادا بوو، سەری لە یەخە بەرزەکەی خزاند بوو و لەسەر کورسیەکە لەبەر هەتاوەکە دانیشتبوو. دایکی کە هەستی کرد ئێمە گەرەکمانە بە تەنێ بین، رۆیی. لێ خوسرەو هیچ قسەیەکی نەدەکرد، حەوت هەشت چۆلەکە لەبەر پێی ئێمەدا، لە باخچەکەدا یارییان دەکرد، دەنگی جریوە جریوی ئەوان و دەنگی دەسکاوەنێك کە دەکەوتە سەر گۆشتی نیوە کوتراوی نێو هاوەنێك، تاقە دەنگ بوون کە دەهاتنە گوێمان.

خوسرەو گوتی: "دەگەڵ دایکمدا باسی چیتان دەکرد؟ بێگومان باسی فروغ. ئەم کیژە تا ئێستا هەزار کەڕەتی بە من گوتووە: خودایە من بە قوربانی تۆ بم، خودایە مەرگم پێش مەرگت بکەوێ. هەر بۆ ئەوەی من روویەکی خۆشی بدەمێ: چۆنە تاقی بکەینەوە، بزانین دەتوانێ خۆی بکاتە قوربانی". چاوە درێژکۆڵەکانی خوسرەو لەم ساتەدا کە خڕ هاتنە بەرچاوم، لە تۆ وایە جۆرە زبرییەکیان لێ دەتکا.

- باش لە نیازو مەبەستت ناگەم.

خوسرەو پێکەنی و گوتی: "مەبەستم ئەوەیە کە رۆژی جەژنی قوربان لە جیاتی مەڕ فروغ بکەینە قوربانی".

لەوەیە خەڵکی هەقیان بێ کە دەڵێن، خوسرەو شێت بووە، جا بۆ ئەوەی لەوە پتر درێژە بەم بابەتە نەدا، خوا حافیزیم لێکردو رۆییشتم.

نزیکەی سەعات و نیوێکی بۆ نیوەڕۆ مابوو، کە لە ماڵی خوسرەو وەدەرکەوتم، هێشتا چەند هەنگاوێك نەرۆییشتبووم، ژنێکم بینی کە بەرەو ماڵی ئەوان دەچوو. هەر چەندە سەروچاوی داپۆشی بوو، ناسیمەوە کە فروغ بوو، لەسەری جادەکەدا ماوەیەك وەستام، بەڵام ئەو هەر نەهاتە دەرەوە. دیار بوو کە خوسرە و پێشوازی کردووە. لە راستیدا ئەم قسانەی دوایی خوسرەو خستمیانە گومان و خەیاڵەوە. خوسرەوو من ساڵێك لەمەپێش لە میوانیەکدا لە ماڵی یەکێك لە ناودارانی شاردا فروغمان ناسی. ئەو رۆژە فروغ جلێکی پولەکەی پەمەیی لەبەردا بوو، قژی ساف بۆ خوارەوە شانە کردبوو، و گودلەیەکی چەتر ئاسای لەسەر تەوێڵی دانا بوو، کە خانە خوێیەکەمان، خوسرەو منی بەوو بە دایکی ناساند، فروغ سوور بووەوە، گوایە ئەوە یەکەمجاری بوو کە لە مەجلیسێکی وا گەورەدا بەبێ چارشێو دەرکەوتبوو. هەروەها فروغ لەو رۆژانەدا کارنامەی پۆلی یازدەیەمی وەرگرتبوو و خوێندنی تەواو کرد بوو. لە کاتی فراڤیندا فروغ لە نێوان من و خوسرەودا رۆنیشتبوو. وا دیار بوو پەزێرایی ئێمەیان بەو سپاردبوو، بەڵام من لە ژێرەوە دەم بینی کە فروغ بە خۆی شپرزەو دەسەپاچە بوو، لەوە دەچوو بەکارهێنانی چەقۆو چەتاڵ و کەوچکی گەورەو بچووك و دەستەسڕی سپی کە کەللە شەکر ئاسا بە دەوری قاپەکانیانا دانا بوو، بۆ ئەو کارێکی زەحمەت و ناخۆش بوو.

خوسرەو ئەو رۆژە بە پێچەوانەوە زۆر کەیف سازو رووخۆش دەهاتە بەرچاو، بەڕای من زەخیرەی یەك مانگی دیکەی سوعبەت و رابواردنی پەیدا کردبوو. لە کاتێکا کە فروغ زۆر شەرمنانە

دانیشـتبوو، خوسـرەو لـە هـەموو لایەکـەوە و لەگـەڵ هـەموو کەسـێکدا خـەریکی قسـەو بـاس و پرسیارو وەڵام بوو، لـە ناکاودا روویکردە مـن و گـوتی: "مـن و تـۆ دەبـێ خۆشحاڵ بین کـە فـروغ خانمیـان کـردووە بـە هاوسـێمان". فـروغ لـە بەرانبـەردا، بـۆ ئـەوەی فـرە ویـڵ و ماریفـەت بنـوێنێ گوتی: "بە پێچەوانەوە، من سەر بەرزم بەمەی کە بووم بە هاوسێی کەسانی مەزن".

دوای فراقین من و خوسرەو رۆنیشتبووین‌و یاری شـەترەنجمان دەکرد، هەنـدێك لـە میوانـەکان لـە ژوورەکانی دیکەدا یا چاپان دەخواردەوە یان قسەیان دەکرد. وا دایار بوو زۆربەی قسەوباسەکان دەربارەی خوسرەو بوون. چونکە لەو رۆژانـەدا خوسـرەو کتێبـە بەنێوبانگەکەی بڵاو کردبـووەوە. هەمان ئەو کتێبەی کە بە دوایـەمین بەرهـەمی ئـەو دژمێـردرێ. دایکـی فـروغ لـەولاوە دانیشـتبوو و خانەخوێیەکـەمان کیژەکـەی بـۆ لای ئێمـە هێنـا، کتێبەکـەی خوسـرەوی بـە دەسـتەوە بـوو و دەیخوێنـدەوە، لـە پـڕ بـۆ ئـەوەی خوێنـەواری خـۆی بنـوێنێ و پرسـیارێك بکـات کـە لـە کیـژێکی خوێنـەواری خـودان دیپلـۆمی ئامـادەیی بوەشـێتەوە، پرسـی: "ئاغـا ببـورن لێـرەدا فەرمووتانـە: روناکی چراکە کە لە ژێـر چـەترە سـوور رەنگەکەیـەوە دادەچـۆڕا، شـەقڵ و حاڵـەتێکی رەمـزی و ئەفسانەیی بە ژوورەکە دەدا. مەبەست چییە؟".

خوسـرەو ئەسـپەکەی هـەڵگرتبوو دەیویسـت حەرەکـەتی پـێ بکـات، لـێ بـۆ چـەند سـاتێك بـە دەم بزەیەکەوە تێفکری و گوتی: "مەبەست ئەمەیە کە فروغ خـانم لـوتفێ بکـات و چاپەك بـە ئێمـەش بدات".

فروغی داماو بەم وەڵامە نەگونجاوە کەمێك سورهەڵگەڕاو رۆیـی، پاشـان خوسـرەو بـە مـنی گـوت: "بینیت؟ لە تی تۆیە".

پاشـان فـروغ و دایکیمـان لـە "کافـەتریای لالـەزار"دا هەنـدێ جـار بـە چارشـێوو هەنـدێ جـار بـێ چارشـێو دەبـینی. دایکـی فـروغ بـە شـێوەیەکی گشـتی حـەزی لـێ بـوو کیژەکـەی دابمـەزرێنێ. خوسرەو کوڕێکی قۆزو لە بنەماڵەیەکی باش بوو، ئێستا کارو پارەی نەبوو، ئەمـە گرینـگ نـەبوو، چـونکە ئـەوان پێویسـتیان بـە پـارە نـەبوو، تاقـە شـتێك کـە ئـەوی نیگـەران کردبـوو، ئەمـە بـوو کـە خوسرەو لە ماڵەوە زۆر ئاکار نا پەسند بوو، ئەمەی لە رێگەی ژنانەوە ژنەوتبوو، ئەوەش شـتێکی وەها نەبوو، لەوەیە لەگەڵ ژنەکەیدا نەرم و ملایم بێ.

پاشـانیش فـروغ کـە شـوێنەکەی ئێمـەی پێـدەزانی، هەنـدێ جـار بـە تـەنێ بـۆ کافـەتریای لالـەزار دەهات و لەم کاتانەدا خوسرەو لە بەینی سـەعات حـەوت بـۆ هەشـت بـە گـەلێ دەکـەوت‌و بـۆ مـاڵی دەگەیاندەوە، بەڵام هەندێ جاریش رێك دەکـەوت کـە خوسـرەو هەسـتی بکردایـە کـە لەوەیـە فـروغ بێـت. پێشـتر دەڕۆیـی، یـان منیشـی لەگـەڵ خۆیـدا دەبـرد. هـەموو پەیوەندییـەکی مـن و خوسـرەو لەگەڵ فروغ دا تا کاتی نەخۆشکەوتنەکەی خوسرەو هەر ئەمەندە بوو.

لـەم ماوەیـەدا خوسـرەو بـۆ یەکـەمین جـار فـروغ دەبـینێ و فـروغ کـاتێ کـە بـۆ مـاڵی ئـەوان دەچـوو رووی لـە مـن وەردەگێـڕا، خـۆی لـێ دەشـاردەوە. وا دیـارە بـە دایکیشـی ناڵێـت کـە بـۆ ئەوێنـدەر دەچـێت. فـروغ خوسـرەوی زۆر خـۆش گەرەکـە. گـرینگ تـرین شـت ئـەو قسـەیە بـوو کـە ئـەمڕۆ خوسرەو دەربارەی فروغ کردبووی. ئاخۆ مەبەستی چ بووە؟ کۆمـەڵێك بیرو ئەندێشـەی پـەرت و

بلاو كه به هيچ كلۆجێ نەمدەتوانی پێكيانەوە گرێ بدەم‌و بيانبەمەوە سەريەك به زەين و مێشكم دا دەهات. تا دوو سێ رۆژ بۆ ماڵی خوسرەو نەچووم، بەڵام دڵ پەشێوی ئەو بووم، رۆژێك به بەرماڵی فروغ دا رەت دەبووم، له خۆڕا له دەركەمدا، نۆكەرەكەيان گوتی: "خانمان له ماڵ نينه".
كه گەڕامەوە ماڵێ سەيرم كرد خوسرەو كاغەزێكی ناردووە كه به زووترين كات خۆم بگەيەنمە لای ئەو.
خوسرەون پۆستين لەبەر، لەسەر كورسيەك لەبەر هەتاوەكە له نێو حەوشەدا رۆنيشتبوو، لق و پۆپی ئەو دار زەردەلوەی كه تازە شكۆفەی پەمەيی كردبوو، سێبەريان خستبووە سەر سەری.
خوشكه بچووكەكەی لەلايەوە دانيشتبوو و لالەنگی بۆ پاك دەكرد. خوسرەو گوتی: "دەك به خێرێی، خێرو خۆشيت هێنا".
- هەر بژی، خێرو خۆشيت بێتە رێ.
بزەيەكی كرد، ئەوجا بێدەنگ بوو، ئەم زەردەخەنەيە يەكێك بوو له سيفەتە تايبەتەكانی ئەو. من پەلەم بوو، بەڵام ئەو عادەتی وابوو هەموو شتێكی بە سەبرو خوێن ساردی وەردەگرت، خوشكەكەی بزەيەكی كردو رۆيی.
- فەرموو لالەنگی بخۆ.
- خوا سايەتان كەم نەكا.
- بارەكەڵڵا، به راستی فێری ماريفەت بووی.
من وەڵامێكی له بارم نەدۆزييەوە، خوسرەويش حاڵەتێكی جدی له خۆ گرت، لێم پرسی: "ئيشی چيت پێم بوو؟ ئێستا كه چوومەوە ماڵێ كاغەزەكەم بينيت".
- كارێكی وام نيه، دەمويست سەبارەت به زەماوەندی خۆم قسەت لەگەڵ بكەم.
به پەله پەل پرسيم: "تۆ؟ زەماوەند؟ لەگەڵ كێدا؟"
- لەگەڵ فروغ.
- لەگەڵ فروغ؟
- دياره زۆرت پێ سەيره، بۆچی؟ مەگەر نابێ من ژن بێنم؟.
بە چاوە درێژ كۆڵەو دەموچاوە سێ گۆشەكەيەوە، بزەيەكی غەريبی دەكرد. پشتم بە كورسييەكەوە دا، لاقم خستنه سەر لاق و گوتم: "موبارەكە".
بەڵام له دڵی خۆمدا هەزارو يەك بيری ترم كردەوە: ئاخر مەگەر تۆ نەخۆش نيت. تۆ سيلت نيه، فروغی داماو چ گوناهێكی هەيه كه تۆی ناسيوە. خوسرەو لەبەر چاوم مەحو بووەوە، گۆنای بەرجەستەی ئێسكەپەيكەری مردوويەك له جياتی خوسرەو لەسەر كورسييەكەی بەردەمم هاتە بەرچاوم. فروغ دەستە ناسكەكانی بەسەر ئەم ئێسكانەدا دێنا... خوسرەو كورسييەكەی خۆی لێ نزيكتر كردمەوە و گوتی: "هەست دەكەم كەمێك سەرت لەم كارە سوڕدەمێنێ، و ئەم هەڵوێستەی من به زبرو نالەبار دەزانێ، تۆ دەزانی من چ دەردو ئازارێ دەكێشم؟ تۆ دەزانی من چۆن دەسوتێم؟ بۆچی دەبێ له تاق لاويدا بمرم؟ هەر لەبەر ئەوەی له خەڵكانی تر باشترو باڵاترم. هەر لەبەر ئەوەی من زياتر شت دەبينم‌و تێ دەگەم. من كه خەڵكی دەبينم لەزەت دەبەن.

ناڕەحەت دەبم، ئازار دەکێشم... ئەوجا بە چ مەعلومە کە من دەمرم. بەڵکو باشتر ببم. لەوەیە زەماوەند بۆم ببێ بە شیفا، تۆ بە خۆت دەڵێی کە من سیلم نییە، من نەخۆشییەکەم تەواو بووە. بە چیا دیارە کە فروغ لەگەڵ مندا بەدبەخت دەبێ، لەوەیە بەختەوەر ببێ".

ماوەیەك قسەی کردو من هەر سەیرم دەکرد. دوا قسەکانی ئەمە بوو: "بۆ دەبێ من بەرگری لە خۆم بکەم. ئەو هێزەی منی تووشی سیل کردووەو دەخوازێ بمکوژێت، هیچ بەرگرییەك لە خۆی دەکات؟ منیش هێزێکم بۆ خۆم دەبێ مەیدانێ بۆ باڵەفڕکێی خۆم بدۆزمەوە.

قسەکانی قەناعەتیان پێنەکردم. بەڵام راستی دەکرد. قسەکانی کاریان لە دڵم کرد. بە هەر حاڵ ئەو ترسەی کە زەماوەندی ئەو لە هەوەڵەوە لای دروست کردم، بەرە بەرە رەوییەوە، بەڵام من دڵتەنگی شتێکی تر بووم، دەترسام کە هەموو نەخشەکەی خۆی بۆ باس نەکردبم، بە هەر حاڵ هاتمە رەدا، پێشتر بە خۆی قسەی دەگەڵ فروغ کردبوو، دایکی خوسرەویش بەم زەماوەندە قاییل بوو بوو و ئامادە بوو هەموو یارمەتیەکی بدا، دکتۆریش ئەم زەماوەندەی پەسند کردبوو، بەڵام بە پارێزەوە گوتبووی: "لەگینە بۆ خوسرەو زۆر باش بێ، لەوەشە بۆ هەردووگیان ترسناك بێ". خوسرەو نەخشەکەی خۆی بەمجۆرە بۆ من باسکرد: "بڕیارم داوە ئەو موڵکەی کە لە شەهریاردا بە میرات بۆم ماوەتەوە، بفرۆشم، نزیکەی دە- دوانزە هەزار تمەن دەکات، بەم پارەیە لە گەیلان یا لە لا هیچان و یان لە نزیکی دەریادا پارچە زەوییەك دەکڕم و لەوێندەر خانوویەك دروست دەکەم و خەریکی فەلاحەتی دەبم. بەڵام بە نیازم کە لەم ماڵە تازەیەدا زەماوەند بکەم". منی راسپارد بوو کە دەگەڵ دایکی فروغ دا قسە بکەم.

ئەنجام هەموو ئەم کارانە نزیکەی هەشت مانگ و نیوی برد، دایکی فروغ ئەگەرچی بە رواڵەت کەمێك نیگەرانی ئەمە بوو کە خوسرەو نەخۆشە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی و لە دڵەوە ئەم ویساڵەی پێ خۆش بوو. دایکی خوسرەو لەبەر ئەمەی کە کوڕەکەی دڵی خۆش بوو و هەندێ جاریش رێدەکەوت دەگەڵ ئەودا پێ بکەنێ، زۆر شاد بوو. هەقیشی بوو، زەماوەندی کوڕان و کیژان بۆ باوکان و دایکان یادەوەرییەکی زندووی زەماوەندی خۆیانە. لە رودسەر، لە کەناری دەریادا خانوویەکی هاوێنە کە روو لە دەریاو بەرهەیوانێکی پانی هەبوو و بەردەمەکەی یەکپارچە شووشەبەن بوو، هاتە دامەزران، من و خوسرەو سێ مانگی هاوێن خەریکی دروستکردنی بووین، بە شێوەیەکی کاتی ئەو خانووە کردرا، خوسرەو قەناعەتی وابوو کە زەویەکە پاشان کە لەگەڵ خەڵکی ناوچەکەدا ئاشنایەتیمان پەیدا کرد، دەکڕین. ئەوپەڕی دیقەت و وردەکاری لە بونیاتنانی ئەم خانووەدا بەکار برا، بەڵام داواو دەستوورەکانی خوسرەو بە جۆرێ بوو کە خانووەکەی زۆر بە سام دەنواند.

کەلوپەل و تفاقی خانووەکەمان لە باشترین موغازان و بە باشترین زەوق و سەلیقە کڕی. من کە دەڵێم باشترین زەوق و سەلیقە، هەڵبەتە زەوق و سەلیقەی من نەبوو، موبێلەی نەرم، مافووری بە نەخش و نیگاری جوان، پەردە پەنجەرەی حەریر، چلچراو قەندیلی برونزکاری ئەسفەهان، پایە چرای لە داری بتەو دروستکراو، هەموو ئەمانە ئەگەرچی جوان بوون، بەڵام خوسرەو رەنگی سەیری هەڵدەبژارد، پتر لە دوو هەزار تمەن بۆ کەلوپەل و تفاقی ژووری نووستن کە خوسرەو

(پەردو)ی ناو نابوو، خەرج کرا. رەنگی تێکڕای کەلوپەل‌و تفاقی ئەم ژووره زێڕین بوو. بەڵام دەیڵێمەوە، ئەمە سەلیقەی من نەبوو. رۆژی هەژدەی بەهمەن چونکە لە تەقویمدا نووسرا بوو کە زەماوەندو زەوجین لەم رۆژەدا موبارەکە، بوك و زاوایان لە ماڵی دایکی فروغ دا لێکدی مارە کرد. هەر ئەو رۆژە فروغ و خوسرەو بەرەو رودسەر وەڕێکەوتن.

دوای دوو رۆژ دایکی خوسرەو و داکی فروغ و من بە سواری ئوتۆمبیلێکی (هودسن) بەلا هیجاندا تیٚ پەڕین. قەرار وابوو کە بووك و زاوا دەمەو ئێواریٚ بچنە خانووی تازەوەو ئێمە بۆ بەیانی بگەینە ئەوێندەر. لە رێگەدا بایەکی توندی دەهات، بایەکە پارچە بەفری سەر درەختەکانی بە ئاسماندا دەبرد. ئەو نەعرەتەو گڤ و هورەی کە مەعلوم نەبوو لە گەرووی بایەکەوە دێتە دەریٚ یان لە جەرگەی سروشتەوە، کارێکی غەریبی لە گوێی گوێدیرا چیٚ دەکرد، دایکی فروغ و دایکی خوسرەو پێدەکەنین، بەڵام من پێشبینی بەڵایەکم دەکرد، دڵم بیٚ ئۆقرە بوو، ئوتومبیلەکە بە جادەیەکی گڵی پڕ لە بەفرا تیٚ دەپەڕی و سات بە سات لەو خانووەی نزیك دەکردینەوە کە ئەمڕۆکە لەبەر چاوی من سامناك بوو بوو. سەعات نۆو نیو ئوتومبیلەکەمان لەبەر ماڵەکەدا وەستا. دەرگا کراوە بوو :بۆچی هیچ کارەکەرو خولامێك دیار نەبوو؟! بە پێچەوانەوەی تەمای خۆمانەوە، هیچ کەسێك لە دالان و راڕەوی خانووەکەوە نەهاتە پێشوازیمان. هێشتا چراکەی دویٚ شەو دەسوتا، دوو کەڵی دەکرد. لە رۆژێکی وادا کە دەبیٚ ئاهەنگی زەماوەند بگێڕدریٚ، هەق نەبوو ئەم ماڵە بەمجۆرە کڕو کپ و خامۆش بیٚ، بە قاڵدرمەکاندا چووینە سەرەوە. لە دالانی قاتی یەکەمدا کابرایەکی ئەرمەنی کە کەمانەکەی بە دەستەو گرتبوو و یەخەی کرا بووەوە، لەسەر کەرەویتەیەك بە دەم خەوەوە دەی پرخاند. لە هۆڵە گەورەکەدا چەند بۆتڵ و پەرداخان لە عاردی کەوتبوون. هەندیٚ لە چراکان هێشتا دەسوتان. لە بادرزێکەوە کە دیار نەبوو، بایەکی توندو سارد خۆی بە هەموو ماڵەکەدا دەکرد، و هەموو پەردەکانی هێنابووە هەلەکەسەماو چراکانی خستبووە جۆلانە، هەر جارەی یەکێك لە دەرگاکان دەکرایەوەو بە دەنگێکی ترسناك دەیدا بە دیوارەکاندا. من گوێم بە ژنەکان نەدا، چونکە شارەزای ماڵەکە بووم. هەوەڵجار خۆم بە ژووری نووستنەکەدا کرد، لێفەکانی سەر تەختە خەوەکە پەرش و بڵاو درابوو بە یەکا. کەس لەویٚ نەبوو. بایەکە لە هەیوانەکەوە دەهات. بەپەلە چووم بۆ ئەویٚ تا پەنجەرەکە پێوەبدەم. بایەکی توند دەهاتە ژووریٚ و پروشە بەفران بە ئاسمانەوە دەرەقسین. لە پەنجەرەکەوە دەریا دیار بوو. ئاوەکە کەفی کردبوو، شەپۆلەکان بە توندی سەریان بە دیواری خانووەکەدا دەکێشا، لە تۆ وایە دەیانەویٚ ئەم ماڵە لە بناغەوە هەڵتەکێنن، ژێرو ژووری بکەن. فروغ لە نزیکی پەنجەرەکەدا بە عەزیزی سپییەوە، بە قژی پەخش و پەرێشانەوە لە عاردی کەوتبوو. وامزانی مردووە، جوڵەی نەدەکرد، بەدەنی دەتگوت سەهۆڵە، لاقەکانی سڕ بوو بوو. کە لێی نزیك بوومەوەو لە عاردیم هەستاندو روانیمە دەموچاوی، بە چاوەکانی ئاماژەی بۆ دەریاکە کرد.

* * *

دوای ساڵێك (فروغ)یش بە نەخۆشی سیل مرد، ئەو بوو بە قوربانی هەمووان، ئەم بوو بە قوربانی ئەو!

تاران– فەروەردین ١٣١٢

## سەمای مەرگ

"١"

دوێنی بەیانی بردیان. دوو رۆژە کە بردوویانە. لە دوێنێ بەیانیەوە تاکو ئێستا گوێم بە ئاهەنگی سـەمای مـەرگ-Dance macabre دەزرنگێتـەوە. مورتـەزا دەسـتی رەجـەب عـەلی رەجـەبۆفی گرتووە، لە نیوە شەودا لە قەبرەکەی دێتە دەرێ. مردوویەکی دیکە بە ئێسکێکی دەستی کیژێك لەسـەر کاژەڵـەی لاوێك ئاهـەنگی سـامناکی (سـەمای مـەرگ) لـێ دەدات، گۆڕەکـان دەم دەکەنـەوە، ئێسەپەیکەرەکان لە گۆڕ دێنە دەرەوەو بە کۆمەڵ سرووودی مـەرگ دەڵێن‌و هەڵدەپـەڕن، مارگرێتـا، بە سەروچاوی پڕ ئازار، بەڵام زندووەوە تەمەشا دەکات، دەیەوێ مورتەزا لەم سەما دەستەجەمیە بێنێتە دەرێ.

دوێکە ئەویان برد. بە بەرچاوی ئێمەوە بردیان. ئەو کەسەیان برد کـە سـێ دانـە مـانگ شـەوو رۆژ لەگـەڵی بـووین، هـاو سفرەو خـۆراکی بـووین، ئـەو کەسـەیان بـرد کـە شـەڕی دەگـەڵ کردبـووین‌و پاشان ئاشت بوو بووەوە، ئەو کەسەیان برد کە تانەو تەشەرمان لێدا بووو پاشـان تـەوازۆمان لێ خواسـتبوو. ئـەو کەسـەیان بـرد کـە لـە لامانـا دەگریـاو دەی هێنایـنـە پێکـەنین، ئـەو کەسـە کـە لـە نەگبـەتی‌و بەدبەختیـدا شـەریکی دەردو خـەممان بـووو لـە نائومێدی دا ئومێـدی پـێ دەبەخشـین، ئەو زندانیەیان بە بەرچاوی ئێمەی زندانیانەوە بردو پێشیان نەگوتین کە بۆ کوێیان بـرد، بـەڵام با نەشیڵێن دەزانم بۆ کوێیان برد. بردیان تا بیکوژن. حوکمی مەرگ درا بوو.

مورتـەزا رۆیـی. مورتـەزا لـە سەمای مردووەکانـدا کـە هـەموو شـەوێك لـە نیـوە شـەوەوە تـا بـانگی کەڵەبەبابی بەیانی لە گۆڕستانەکەدا دەیکـەن بـە بـەزم هـەراوزەنا، بەشـداری دەکـات. دوا سـەعاتی ئـازادی ئـەوم لەبەرچـاوە. بـە باشـی دەی بیـنم، دەنگـی دەژنـەوم کـە هـاوار دەکـات: "مارگرێتـا، مارگرێتا. بە کەس نەڵێی! بە هیچ کەسێك."

مـن لـەم چـەند سـاڵەی ژیـانی زینـدان دا - ژیـان نـا، زندەبەچـاڵی- مـن لـەم چـەند سـاڵەی زندەبەچاڵیەمدا زۆر کاندیـدی مـەرگم دیتـووە. دیتوومـە کـە چـۆن لـە کـاتی راگەیانـدنی قـەرارو حوکمی دادگادا رەنگیان پەڕیوە، زرانیان شل بووەو نزیك بـووە هـەر لەوێدا گیانیـان دەربچێت، بـەڵام ئـەم حاڵەتـە لـە چـاو تروکانێـك پـتری نەخایانـدوەو یەکسـەر هێڤـی‌و ئومێـدەواری جێـی گرتووەتـەوە، ئومێدەواری بـە هەڵوەشـانەوەی فـەرمان، ئومێدەواری بـە عـەفوات، ئومێدەواری بـە ژێرو ژوور بوونی هەموو دنیا، تەنیا بۆ رزگاری ئەوانە، ئومێدەواری بە موجیزات‌و پـەڕجوو، نـەك هەر ئومێدو هێڤیدار بوون، بەڵکو باوەڕهێنان بـە پوچترین بـێ ئـەقڵی‌و تەسـەورو وێنـای ئەمـە کـە لەگینە شا رەحمی بتلیسێتەوەو ئەوانە عەفو بکات. من مـەحکوم بـە مـەرگێك دەناسـم کـە شـەوی بەر لە ئەنجامدانی فرمانەکە مرد. من مەحکوم بە مەرگێك دەناسم کە بەر لە تیرباران کـردن ردێنـی تاشی، جلکی جوانی لەبەر کرد، خواحافیزی لە دۆستەکانی کردو پیاوانەو مەردانـە بـەرەو پیری مەرگ رۆیی.

من یەکێك لەو مەحکومانە دەناسم کە لە کاتی مردندا هورای دەکێشا "بژی ئێران".
من مەحکوم بە مەرگێك دەناسم کە ئاهەنگی سروودی "ڕابە ئەی داغی نەفرەت خواردوو، دنیای رووت و برسیان"ی تا ماوەیەك پاش دەست ڕێژی تفەنگەکانیش لە ئاسماندا دەنگی دەدایەوە.
بەڵام من هیچ یەکێك لەوانەم بەم نزیکییە نەدەناسی. زۆریانم دیتبوو. کەسیانیان لە نێو ئێمەوە و بە بەرچاوی ئێمەوە نەبرد، وەك ئەوەی مەڕێك لە نێو مێگەلێکدا بۆ کوشتنەوە هەڵبژێرن.
دوێنێ بەیانی سەعات حەوت و نیو بانگیان کرد. هەمان فەڕاشی پیر بە دەنگی ڕەسا هاوار دەکات. چڵمەکەی هەڵدەمژێ و بانگ دەکات: " مورتەزای کوڕی جەواد، وەرە ئاغا". تەواوێك ئەلف و غەینی "ئاغا" کە درێژ دەکاتەوە و هەرگیز بەلای ئەوەوە گرینگ نیە کە ئەم مورتەزای کوڕی جەوادەی دەنکی مارگرێتای کیژی نۆزدە ساڵە، بۆ حەپسی ئینفرادی دەبەن کە دیق کوژی بکەن، بۆ مەرەخەسی دەبەن، دەیانەوێ جەڵدەی لێ بدەن، دەیانەوێ ئەشکەنجەی بدەن، عەفوی بکەن، بۆ تاراوگەی بنێرن، بۆ پای قەنارەی بەرن یان تیربارانی بکەن، بۆ ئەو هیچ فەرقێك ناکات.
ئەو تەنیا هاوار دەکات: "مورتەزا جەواد! وەرە ئاغا" و یەکسەر دوای ئەو چەند نەفەرێکی دیکەش، لەوانە پاسەوانی قاوشی شەش و فەڕاشەکانی هەمان قاوش و دەست نێژەکانی ئەوان هاوار دەکەن: "مورتەزا جەواد."
بەڵام بەندی دڵی ئێمە پچڕا. هەندێك دەستیان بە کۆکردنەوەی شڕو شیتاڵەکانی، یان شمەکەکانی کرد.
دوای تۆزێك یەکێك لێی پرسین: " بەشمەکەوە؟ هەنگێ وەڵام درایەوە: "نە، بۆ دادگا"
دەڕۆیی کە بمرێت. بێگومان لە سێدارەی دەدەن. لەوەیە مارگرێتا لەبەر دەرگای زیندان وەستابێ و بەر لە مردن جارێکی دی یەکتر ببینن. بێگومان لەبەر زیندانیشدا، پێی دەڵێت: "مارگرێتا، مارگرێتا بە هیچ کەس نەڵێی، بە هیچ کەسێك"
مورتەزیان بۆ دادگا نەدەبرد، درۆدەکەن، بە هیچ مەحکومێك لە سەعاتی پێش مردنەکەیدا ناڵێن کە بۆ ئیعدامت دەبەین. بەدرۆ رایدەگرن.
کاتێ مورتەزا خەریك بوو لە ژوورەکەی ئێمە وەدەردەکەوت گەڕایەوەو گوتی: "دنیا بارانە، یەکێکتان کڵاوەکەیم بداتێ." چەند کەسێك کڵاوەکانیان بۆ درێژ کرد. ئەوەی منی هەڵگرت.
چ بنیادەمێکی ساویلکەیە! هەموو مەحکومانی ئیعدام ساویلکە دەبن. زەحمەتە وێنای ئەمە بکرێ کە ئەم بەدەنە، بەم پێکهاتەو بونیادەوە، بەم هزرو بیرەوە، بەم هەموو خۆزیاو ئومێدەوە، بەم هەموو ئەشقەوە دەرهەق بە مارگرێتا، دوای چەند سەعاتێکی دیکە تێك و پێك دەشکێت و هیچ شتێکی لێ نامێنێتەوە. ئەستەمە.
بۆ ئیعدام دەبرا،و دەترسا باران سەری تەڕ بکات، ڕەنگە پەشۆکا بێ. لەوەشە لە مەرگ و مردن بێ منەت بێ. وا باوە کاتێ یەکێك بۆ ئیعدام دەبەن، دەڵێن: "بەشمەکەوە" ئەوسا جلکی خەوو قەرەوێڵەو تەختە خەوو جلك و بەرگەکەی لێ وەردەگرن و لە ئۆفیسی زندانی دادەنەن. ئەگەر خانەوادەو کەس و کاری هەبێ، دەیدەنەوە بە خانەوادەکەی، ئەگەر نەی بێ، نازانم چی لێدەکەن.

کە بەبێ شمەكو سیپاڵان بردیان هەموومان تروسكەیەكی ئومێدمان كەوتە دڵ، ئایا دەشێت بۆ ئیعدامیان نەبردبێ؟

ئێستاش دەنگی لە گوێم دا دەزرنگێتەوە: "مارگرێتا، مارگرێنا، ئەمە بە كەس نەڵێی، بە هیچ كەسێك."

تۆ بڵێی مارگرێتا شتێكی بە كەسێك گوتبێ؟ ئایا شتی وا هی دەبێت؟ ئەگەر وابێ كاشكا مورتەزا دەمرد. بەڵام نا، ئەم بیرانە دروست نین. مورتەزا دوێ شەو لە سەمای نیوەشەوی مردووواندا بەشداری كردووە. لەوێ دەستی رەجەب عەلی رەجەبۆفی گرتووەو هەردووان پێكڤە ئازادانە رەقسیون. ئەم دەنگە سامناكانەی (سەمای مەرگ) بەدەنم دێنێتە لەرزە. سەمای ئیسكەپەیكەرەكانم لە بەرچاوە...

من بە خۆم حوكمەكەی ئەوم خوێندەوە: "مورتەزا ف. كوڕی جەواد، بە تۆمەتی قەتڵی عەمدی رەجەب عەلی رەجەب زادەی كوڕی حاجی رەجەبی باكۆیی، ئاكنجی تاران خراوەتە ژێر چاودێریو تاقیبی دادگای شارەوە."و دوای چەند رستەیەكی دیكە كە لە یادم نیە، حوكمە كە تەقریبەن بەمجۆرە لە سەری دەڕوات: "بەگوێرەی هەواڵی پۆلیسو ئاسایشو تەحقیقی وردی تۆماركراو لە دۆسیەی كارو بە گوێرەی ئیعترافی رێكو رەوانی تاوانبار لە بەردەم دادگادا، تاوانباری ئەو لە گۆشەنیگای دادگاوە بێ چەندو چونەو گوناحەكەی حاشا هەڵنەگرو سەلماوە" ئەوجا چەند رستەیەكی دیكە دێتو ئەنجام بەمجۆرە كۆتایی دێ: "بۆیە بە گوێرەی مادەی فلان یاسای سزای گشتی، حوكمی ئیعدام دەدرێ." بە كەماڵی خوێنساردی حوكمەكەی خوێندەوە. بە پێچەوانەوە دەتگوت لە دڵتەنگی قوتار بوو. حوكمەكەی ئیستیناف نەكردەوە.

جا ئێستا لەگینە هێشتا زندوو بێ؟ دەشێت ئیعدامیان نەكردبێ؟ دوێكە بەیانی بردویانە. رەنگە جەنازەكەیان دابێتەوە بە مارگرێتا. ئەدی ئەو چی لە لاشەی دەنكەكەی كردووە؟ كەسی دیكەی لە تاراندا نەبوو. ئەمە بۆ كار بەدەستان كارێكی فرە ئاسانە. تەلەفۆن بۆ مارگرێتا دەكەن: ((جەنازەی دەنكەكەمان بردویت بۆ ئیمام زادە عەبدوڵلا، ئەگەر حەز دەكەی هەرە بە خۆت بینێژە))

ئیدی بۆچی هەندێ كەس گومان دەكەن؟ ئەویان برد ئیعدامی بكەن. وێڕای ئەو جیاوازی بیرو بۆ چوونانەی كە لە ژوورەكەی ئێمە دا لەسەر ئەم بابەتە هەیە. من كەمترین گومانم نیە كە مورتەزا ئیدی نەماوە و تەواو. مەگەر...مەگەر ژیانێكی خراتر لە مەرگی بەنسیب بێ. ئەوساش من حەزم دەكرد، خۆزیم دەخواست كە بمردایەو لە كۆڵ بایەتەوە. كە لە زینداندا قەراری دادگایان پێ راگەیاند و ئەویش داوای ئیستینافی نەكرد، هەنگێ یەكەم گفتوگۆی دڵسۆزانە لە نێوانماندا دەستی پێكرد:

– بۆچی داوای ئیستیناف ناكەی؟

– ئیستینافی چی؟

– ئیستینافی ئەو حوكمە كە دادگا دەربارەی تۆ داویەتی، سەیرە! چما نازانی حوكمی ئیعدامیان داوی.

دەتگوت باش حاڵ نەبوو بوو کە ئەم حوکمە دەکاتە چی، لە ژووری سێیەمی قاوشی شەشەمدا ئێمە بیست و یەك نەفەرین و تەنیا من بە هەڵە لە نێو ئەوانەدا زیندانی سیاسیم. مەسەلەکەش ئەمەیە کە چونکە من لە زندانی قەسردا دەگەڵ یەکێك لە ئەفسەرانی ئێشکچی دا دەمەقاڵێم بوو، بۆ زیندانی کاتیان دوور خستمەوە، نزیکەی شەش مانگ لە ژوورە ئینفرادیەکانی قاوشی دوودا بووم، جا چونکە لەم دواییانەدا ژمارەیەکی زۆری سیاسیانیان گرت و جێیان نەبووەتەوە، بۆیە منیان بۆ قاوشی گشتی، واتە ئەم قاوشی شەشەمە هێناوە، ئیدی هاو زندانەکانم هەموو بریتین لە دزانی پارەی دەوڵەتی، بەرتیل خۆران، و دەسبڕو کڵاوچیان و هەندێ جار پیاوکوژانیش.

شەوان پاش سەعات نۆ کە هەموو ناچارن بخەون، من بە دزییەوە کتێبەکەم دەردێنم، تاقمێکی چای دەدەم بە پاسەوانی بەرپرس تا خەبەرم لێنەداو هەنگێ بە دڵی ئاسودە دەست بە خوێندنەوەی کتێب دەکەم. ئەگەر ئەفسەرێك، بەڕێوەبەرێك، سەرۆکێك بێت، خودی پاسەوانەکە ئاگادارم دەکاتەوە.

ئەو شەوەی کە حوکمی ئیعدامەکەیان بە مورتەزا راگەیاند سەیرم کرد نەخەوتووە، چونکە دەمزانی کە زمانی فەرەنسی بەڵەدە، کتێبەکەم کرد بە دوو لەتەوەو لەتی یەکەمیم دا بەو. بە تەواوی ئارەزووەوە کتێبەکەی لێ وەرگرتم و لەوەوە دۆستایەتیمان پەیدا کرد. کاتێ کە قەرارەکەی دادگایان پێ راگەیاند لە ژێر قەرارەکەدا نووسی: "بینرا."

ئێمە هەموو حەپەساین، چونکە پێشتر کەم دابێژێکمان لەمەڕ رەوتی دادگاییەکە لەو پاسەوانە ژنەوتبوو کە ئەوی بۆ دادگا بردو دەمانزانی کە هیچ قەرینەو بەڵگەیەك لە دادگادا دژی ئەو نەبووە، جگە لە ئیعترافی راشکاوانەی خۆی کە گوتبووی: "من کوشتوومە."

گوتبووی کە من رەجەب عەلی رەجەبۆڤ باکۆییم کوشت.

جارێ دووەم و سێیەمیش کە من پێ داگریم کردو لێم پرسی: "بۆچی ئیعتراز لەم حوکمە ناگری، بۆ ئیستینافی ناکەیەوە؟"

گوتی: "فایدەی چییە؟"

– چۆن فایدەی نییە؟ فایدەکەی ئەمەیە کە لەگینە تەبرێ دەرچیت و نەتکوژن.

– من گوناحێکم کردووەو دەبێ سزاکەی بدەم.

– چ گوناحێکت کردووە؟

– بنیادەمم کوشتووە.

– تۆ؟

من ئەوەندە پەریشان و شپرزە بووم کە هێمنی و خوێن ساردیەکەی ئەو نەیدەتوانی بە هیچ جۆرێ کارم تێ بکات. ئەنجام نەم توانی لەوەی کە بە مەزندە دەمزانی و لەم لاو لەولاوە بیستبووم و لە دڵمدا پەنگی خواردبووە، لە دڵی خۆدا بێڵمەوەو گوتم: "من هەرگیز باوەڕ ناکەم کە تۆ پیاوکوژ بی، ئەم کارە لە تۆ ناوەشێتەوە.دروستە کە بە دارو بارو تۆکمەی بەڵام لە دادگادا هیچ بەڵگە دژی تۆ نەسەلماوەو ئەگەر بە خۆت ئیعترافت نەکردبایە، بە هیچ جۆرێ حوکمیان نەدەدایت."

– من پیاوم کوشتووە.

خەریك بوو کۆنترۆڵی خۆم لە دەست بدەم، زیاتر ئەم بێ متمانەییەی ئەو دەهەری دەکردم.

– گوێ بگرە هاوڕێ، من زندانیەکی سیاسیم، ئەوە چوار ساڵ و شتێکە، بەڵکو چوار ساڵ و نیوە کە لە زیندان دام، دەتوانی متمانەو باوەڕی تەواوت بە من هەبێ. رەنگە تۆ لە ژێر گوشاری کەسێکی تردا بی. من زۆر زندانیم دیتووە کە خەتاو گوناحی کەسێکی تری لە ئەستۆ گرتووەو زندان کراوە، هەندێ جار شتی نادیارو راز ئامێز بنیادەم گێرۆدە دەکەن. هەنگێ دەبێ ئەم رازانە کەشف بکەی، خۆ ئەگەر قەراریشت داوە بمری‌و رزگاری خۆت لە مەرگدا دەبینییەوە، هەر دەتوانی بە ئارامی بمریت. ئەگەر ئەو شتەی کە ئەزیەتت دەدات، بە من بڵێی، لەوەیە ئاسودە ببی. لەوەشە چارەیەك بدۆزرێتەوە، لەوەیە بشێت کارێ بکرێ. هێشتا زۆر گەنجی، وەختی مردنت نییە. ئەگەر ژنێ، کەسێکت خۆش دەوێ، بیر لەویش بکەوە، ئاخر لە دوای تۆ ژیانی ئەویش بایەخی نابێ. خۆ بێ کەسیش نیت، کەس نایەتە دیدارت؟ بەڵام زۆر جار خۆراك و پۆشاکێکت بۆ دەنێرن.

ئیدی بۆم دەرکەوت کە دوا تیری تیردانی من بابەتی ژنەو زیاترم خستە کارەوە. من لە زندان دا شارەزاییەکی زۆرم لەمەڕ پیاوکوژان پەیدا کردبوو. زۆربەیان ئەو جووتیارانە بوون کە لەسەر ئاو یان لە ئەنجامی دەسیسە و پیلانی دەرەبەگ و خاوەن موڵکان دا بەگژ یەکتردا چوو بوون و لە ئەنجامدا یەکێك کوژرا بوو، یان خەڵکانێك بوون کە لەسەر ژن خەنیمی خۆیان کوشتبوو، دەستەی سێیەم ئەوانە بوون کە لە تەمەنی پێنج شەش ساڵی دا کەوتبوونە زندان و لە زنداندا دزی وگیرفانبڕی لە دزانی دیکەوە فێر بوو بوون و لە ئەنجامدا دوای پازدە ساڵان دزی و خوێڕیەتی لە دوا نۆرەدا بە چەکەوە چوو بوونە دزی و یەکێکیان کوشتبوو، ئەم دەستەیە کە کۆمەڵگە (پیاوکوژانی خۆڕسك)یان پێ دەڵێت، هەمان ئەو کەسانەن کە خودی کۆمەڵگە بۆ دزی‌و تاوانیان پەروەردە دەکات.

هەستم دەکرد کە هەبێ و نەبێ ژنێك لە چارەنووسی موڕتەزادا دەورێکی هەبووبێ، ناوی ئەم ژنە بە گوتەی ئەو پاسەوانانەی کە بۆ دادگایان دەبردو دێنایەوەو بەگوێرەی مۆری ئۆفیسی زندان کە دەیان نا بەو خۆراك و پۆشاکانەوە کە لە کەسوکاریان وەردەگرتین و حەواڵەی ئێمەیان دەکرد مارگرێتا بوو، من دوا تیری خۆم خستەکار.

– گریمان پیاویشت کوشتووە، تۆ ئەمەت لەبەر خاتری ژنێك کردووە، وانیە؟

– جا باسی ئەمە چ فایدەیەکی هەیە.

– فایدەکەی ئەمەیە کە تۆ نامریت و دەتوانی بەختەوەر ببی.

دەیویست خۆی بدزێتەوەو وەڵامم نەداتەوە. بەڵام من دەستبەردار نەبووم.

– جا ئەگەر ئەم ژنە تۆی ناوێ، بۆچی دەتوێ بمری؟ لە پێناوی ژنێکی وادا کە قەدری تۆ نازانێ، بۆچی گەرەکتە بمری؟

– ئاه، وا نییە، تۆ نازانی کە بەم قسانەت چۆن دڵی من دەسووتێنی.

– یانی خۆشی دەوێی؟ کەواتە بۆ دەبێ بمری؟ هەر تەنگانەیەك فەرەجی خۆی هەیە.

– هیچ فەرەجێك بۆ من نییە.

– چۆن نیە؟ بەڵكو حوكمەكە هەڵوەشێتەوە، بەڵكو دادگاییەكی دی دانرا، بیر بكەوە، رەنگە تۆ كەست نەكوشتبێ، بیسەلمێنە كە تۆ پیاو كوژ نیت، رەنگە پیاوكوژە ئەسڵیەكە بناسیت؟ مەجبور نیت ناوی بدەی، ئەگەر ناتەوێ، رەنگە حوكمی ئەبەدی بدرێی. كێ چوزانێ سبەینێ چ دەبێ؟ لەوەیە عەفو بكرێی، هەزارو یەك ئەگەری دیكەش هەیە...

قسەكەی بڕیم: "نە ئەمەیەو نە ئەوە، من لەم ژیانە وشك و نەگۆڕە بێ تاقەت بووم، ژیانی من مەرگێكی بەرە بەرە بوو. حوكمی ئیعدام بۆ من رزگارییە لەو عەزاب و ئازارانەی كە هیچ كەسێك باری نابات، لە كێشی كەسدا نیە، ژیان بۆ من مەیسەر نییە، ژیان بۆ من نە پێش دەكەوێ و نە باش دەبێت.

– ئەمە قسەیەكی دروست نیە، دنیا روو لە پێشكەوتنە، روو لە چاك بوونە، تۆ سەیری ئەم شەپۆلی دكتاتۆریەت و دڕندایەتیە مەكە كە ئەمڕۆ دنیای گرتووەتەوە، دنیا دەگۆڕێ، پەرەسەندن لە ئارادایە، تۆ چ كارەكەی، چۆن بۆ تۆ خراتر دەبێ؟

– مامۆستا بووم.

بەمجۆرە هێنامە قسان.

باڵا بەرزو تۆكمە بوو. ساغڵەمی لێدەباری. بابی لە مەشروتیەتدا كوژرا بوو. دایكی بەبیر نەدەهات. خوشكەكەی لە شارێكی دیكەدا بەشوو بوو و ئەویش لە ماڵەكەی بابیدا دەژیا. ئەوەی لە باب و داكی بۆ مابووەوە كەمو زۆر خەرجی خوێندنی كرد بوو ئەمیستا لە ئامادەییەكانی تاراندا دەرسی دەگوتەوە، زۆربەی كاتی خۆی بە كتێبانەوە رادەبوراد، كتێبی خۆش دەویست، چونكە شەرمن و دوورە پەرێز بوو لە كۆڕو مەجلیساندا رووی قسەكردنی نەبوو، بۆیە لەزەتی لە كتێب دەبینی. كتێب و لەم دواییانەشدا فیلم و رادیۆ بە گەورەترین لە زەتی ئەو دەژمێردرا، شەیداو دڵبەستەی دۆستۆفسكی نووسەری روس بوو. هەر بۆ ئەوەی كتێبەكانی ئەو بخوێنێتەوە دەیویست روسی فێر ببێ، فەڕەنسیەكی باش بەڵەد بوو، كەمەكێ روسیشی دەزانی، جگە لەمانە هەندێ جار لە چاخانەكانی تاراندا دەردەكەوت و لەگەڵ خەڵكانی دیكەدا شەترەنجی دەكرد، لە سینەماوە خووی بە مۆزیقای فەڕەنگییەوە گرتبوو، لە ماڵەوە رادیۆی هەبوو، ئەم رادیۆیەش خۆی لە خۆیدا بۆ ئەو بوو بوو بە سەرگەرمیەكی تازە، بە جۆرێ كە پێویستی بە تێكەڵبوونی خەڵكی نەبوو، نزیكەی سەدو پەنجا تمەنێك مووچەی قوتابخانەی وەردەگرت، جگە لەوەی كە ساڵی سێ سەد تا پێنج سەد تمەنی موڵكانەی ئەو موڵكانەی كە بەسەر ئەوو چەند ئامۆزایەكی تری و خوشكەكەیدا دابەش دەكرا، بەردەكەوت، ژیانی ئارام، یەكهاوی و بێ كێشەو سەریەشە بوو. بابایەكی بەرزەفڕو پایەخواز نەبوو. بە تەمای وەزیری نەبوو، بە پێچەوانەوە بە چاوی سووك (هەڵبەتە تا رادەیەك) سەیری ئەم جۆرە كەڵكەڵانەی دەكرد.

خوشكەكەی كە چەند ساڵێك لەو گەورەتر بوو، حەزی لێ بوو ژنی بۆ بێنێ و بەمجۆرە بیخاتە سەر راستە رێگەی ژیان. ژن و منداڵ، خۆراكی ماڵ و ئازوقە، بیری زیاد بوونی موچە، دابین كردنی ژیان و ئاسوودەیی كەس و كار، هەموو ئەمانە پیاو لەوە دەگێڕنەوە كە خۆی بخاتە ناو

تۆفانـەوە، کـە بـە کـەنارا بـڕۆی دەبـێ دارعاسـات پـێ بـێ، ئیـدی دەریایـە، لەوەیـە پیـاو بـەرەو نقومگەکێش بکات، بە خۆیشی نەیدەزانی کە ڕێگەی ژیانی چیەو کامەیە. دەریا، تۆفانی خۆش دەویست، خۆ چوونە کەناریش بۆ خۆی ئاسوودەییەك بوو. تـەنیا هەنـدێ جارو بـە دەگمـەن و ئەوەش زۆربەی ئەو کاتەی کە بە تەنیا بوو، لەگێن بوو کە کتێب یان شاشەی سینەما یا مۆزیقاو یـان دەردو بەدبـەختی خـەڵکی، یـان تاسـەو کەڵکەڵەیـەك ئـەو لـەم مـەدارو بازنەیـە بێنێتـە دەرێ، بیهاڕوژێنێ، شێت و شەیدای بکات، بە جۆرێ کە پاش چەند سەعاتێك لەو کارە ژێوان ببێتەوە کە لـە ئـەنجامی هەڵچووندا کردبووی. هـەنگێ دیسـان خـۆی سـاز دەدایـەوەو جارەکی دی خـۆی لەســەر شــاڕێگەی وشــکی ژیــانی ڕۆژانــەدا دەبینییــەوە. بــۆ گۆشــەی ژوورەکــەی کورســیەکی پێویستە، پـارەی کارەبـای ئـەم مانگـە زیـادی کـردووە لـە جیـاتی ئـەوەی سـێ سـەدو پـەنجا تمـەن بدات بە مافورێك ڕەنگە باشتر وابێ کە قەرز بدات: هەر تمەنێك بە قازانجی یەك عەباسی بدات، لـە مانگێـك دا دەکاتـە حـەوت تمـەن، لـە ساڵێکدا دەکاتـە هەشـتاو چـوار تمـەن. هـەر باشـە کـەلێنێك دەگرێ.

بە خـۆی دەیگـوت: "سـواری کەژاوەیـەك بـوو بـووم کـە هەڵتـەك هەڵتـەك لـەم کاروانسـەراوە بـۆ ئـەو کاروانســەرای دەبــرمو هــەر دەیگەیاندمــە مــەنزڵ، بــەڵام ئــەو قــاترەی کــە کەژاوەکــەی ڕادەکێشــا چەموشی دەکردو زۆربـەی کـات دەیویسـت فڕێم بداتـە دەرێـی جادەکـە، ئاخریش هـەر فڕێـی دامـە دەرێی جادەکە"

ئەم ژیانە ڕۆتینی و یەکهاویە لە ناکاو شێوەیەکی دیکەی وەرگرت. مارگرێتا!

لەگەڵ مارگرێتادا، فەسڵێکی دیکە لە ژیانی دەست پێدەکات.

کلیلی نهێنی ژیانی پیاو لە دەستی ژنان دایە.

ئەم ژنە نێوی مارگرێتا بوو.

من بە خـۆم ئـەم ناوەم لـە (ئۆفیسـی پـارەی زنـدانیان)دا خوێنـدووەتـەوە. هەفتـەی پـازدە ریاڵمـان لـە زندان هەیـە. کـەس و کـاری ئێمـە دەتـوانن بـە دڵـی خۆیـان پـارە بـە نـاوی ئێمـەوە بنێرنـە ئۆفیسـی زیندان. بە گوێرەی پارەکە پسوولەمان بـە نـاوەوە دەنووسـن. ئـەم پسـوولانە دەدەن بـە ئێمـەو لـەو دەفتەرەدا کە ناوی وەرگرەکان نووسراوە ئێمەی زندانی ئەم پسوولانە ئیمزا دەکەین.

لەسەر پسولەکەی موڕتەزا لە بەرانبەر ئەم وشانەدا کە لەوێ تۆمار کراوە (نـاوو نـاوی خانـەوادەو ئەدرەسی پارەهێنەکە)) نووسراوە: خات مارگرێتا.

لە سەرەتادا هەموو جارێ لێم دەپرسی: "مارگرێتا کێیە؟" دەیگوت: "نایناسم."

بـەڵام مارگرێتـا زۆرجـار دەهاتـە بـەر زینـدان خـواردنی بـۆ دێنـا، جلکـی نـوێی بـۆ دەکـڕی، پـارەی دەدایە. خواردنەکان دیار بوون کە ژنێکی بە سەلیقە دەی نیرێ. کەڕەتێك پیجامـەیان بـۆ هێنـا. بـە پیتی لاتینی لە سەری نووسرابوو (Mf). موڕتەزا ف دەیتوانی بە سەعاتان دانیشێتو دەستماڵە ئوتوکراوەکان هەڵگێڕو داگێر بکاتو لەزەت لـەم کـارە ببینـێ. ئەگـەر کەسـێك بـەوردی بیروانیبایـە چـاوانی موڕتـەزا، دەی بینـی کـە کـەمێك تـەڕن.. لـە خۆشـیابوو. هـەر چـەندە کـە کاربەدەسـتانی زیندان، بەوپەڕی بێ ویژدانی شیرینییەکانیان لە پاکەت دەردێناو هەڵیاندەڕشتە نێو دەستەسڕی

چڵماوی پاسەوانەکانەوەو بۆیان دەهێنایـن، لەگەڵ ئەوەش دا کاتێ کە شیرینیەکان دەگەییە دەستی مورتەزا، هەم ئەو هەستی دەکردو هەم خەڵکیش هەستیان دەکرد کە ژنێکی ئەمەکداری دڵسۆز لە دەرێ را چاوەنۆری ئەوە..

"مارگرێتا، ئەمە بە کەس نەڵێی، بە هیچ کەسێك..."

ئێستاش ئەم دەنگە لە گوێم دا دەزرنگێتەوە.

رەنگە ئەمرۆ بەیانی کە دەیانویست بیبەنو ئیعدامی بکەن، لەبەر دەرکەی زیندان یەکتریان بینی بێ.

لەوەیە ئەمرۆ پاش نیوەرۆ مامورانی ئاسایشو پۆلیس تەلەفۆنیان بۆ مارگرێتا کردبێ:

"وەرن جەنازەی ئازیزەکەتان بەرنەوە."

رەجەبۆف، کە مەبەست رەجەب عەلی رەجەب زادەکەی لەمەر خۆمانە، مورتەزای بەم کیژە ناساند. بەو هەموو ئارامیو خوێن ساردیو شەرمو حەیایەوە کە من لە مورتەزادا دەمبینی، سەیر ئەمەیە کە هەر کاتێ دەهاتە سەر باسی رەجەبۆف، نەت دەناسییەوە. چاوەکانی ئەبڵەقو دەموچاوی سور هەڵدەگەرا، لێوی دەکەوتە تەتەڵە. هەردووك دەستی رادەوەشاند، وشە لەزاریا دەلەرزیو توندو تێکەڵو پێکەڵ دەهاتە دەرێ، بەرادەیەك کە هەندێ جار دەکەوتە تەتەپەتە. بەمجۆرەی باس دەکرد: "رەجەبۆف لەو زەلامانە بوو لە قاوەخانانـدا عارەقی دەکردە پەرداخی ئاو خواردنەوەوە، کەبابو ناسکە توری رادەسپاردو، مڵچە مڵچ دەیخواردو کەیفی دەکرد. چونکە موسوڵمان بووو نەیدەویست لە بازارا ناوی بزرێو ئیحتوباری زەدەداربێ."

یان دەیگوت: " رەجەبۆف دایمە لەگەڵ تاقمێکدا ناکۆكو دەگەڵ دەستەیەکی دی دا هەمیشە کۆك بوو. لەگەڵ ئەو تاقمەدا کە کاری پێیان نەبوو و بە بیریا نەدەهات کە ئەم کەسە لەگینە رۆژێ لە رۆژان سوودێکی پێ بگەیەنێ، هەمیشە دردۆنگو ناکۆك بوو و لەگەڵ دەستەکەی تردا هەزارو یەك باسو گەنگەشەی هەڤدژو بێ سەروبەری بە قازانجی خۆی لێك دەدایەوەو هەمیشە کۆك بوو. بە هەرحاڵ رەجەبۆف وەکو زۆربەی خەڵکی بوو.

"لەگەڵ بابی مارگرێتادا، کە بە یەکێك لە دۆستانی خۆی دەزانی، هەمیشە تەباو کۆك بوو. کەرەتێك لە میواندارییەکدا شەراب بەکراسە پەمەییە کاڵەکەی مارگرێتادا رژا بوو. کراسێکی جوان بوو. زۆرم حەز لێ بوو. خۆیشی ئەو کراسەی خۆشدەویستو زۆرجار بەو پەڵەیەشەوە کە تارادەیەك چوو بووەوە، لە بەری دەکرد. رەجەبۆف جارێك ئەو پەڵەیەی بینیو پرسی! "بۆچی کراسەکەت پەڵاوی کردووە؟" مارگرێتا رووی کردە بابیو گوتی:" بینیت بابۆ، دەتگوت پەڵەکە رۆییوە، بینیت نەرۆییوە." بابی روویکردە رەجەبۆف: "چما تۆ هیچ پەڵەیەك دەبینی؟" رەجەبۆف لە پەرسڤدا گوتی: "پەڵە، نەخێر، با تەمەشایەك بکەم. نەخێر، تەقریبەن چ شتێك دیار نیە. نەخێر هیچ شتێك نابینرێ. هەر هیچ شتێك دیارنیە،" من لەو رۆژەوە بۆم دەرکەوت کە چۆن بنیادەمێکە."

ئاشنایەتی مورتەزاو مارگرێتا بەمجۆرە بوو، مورتەزا دەیویست روسی فێر بێو بە دووی موعەلیمی روسیدا دەگەرا. یەکێك لە ئاشناکانی بە رەجەفۆفی، کە روسی دەزانی، ناساند تا

بەڵكو ئەو كەسێكی روسی زانی بۆ بدۆزێتەوە كە بتوانێ وانەی روسی پێ بڵێتەوە. پاش ماوەیەك رەجەبۆف پێی گوت: "زۆرچاكە، چونكە من متمانەم بەتۆ پەیدا كردووەو دەزانم كە تۆ لاوێكی نەجیبو خانەدانی، دەمەوێ خزمەتێكت پێ بكەم. من یەكێكم خۆش دەوێ كە بنیادەمێكی زۆر چاكە، كیژێكی هەیە كە روسیەكی باش دەزانێ، ئەگەر مەیلت لێیە، تۆ فەرەنسی بەو بڵێوەو ئەویش روسی بە تۆ بڵێتەوە."

مورتەزا چونكە بنیادەمێكی شەرمنە، نەیدەویست ئەم پێشنیازە قەبوڵ بكاتو گوتی: "زۆر سوپاس. بەڵام حەزم دەكرد مامۆستایەكی پیاوم هەبێ و بە پارە دەرسم پێ بڵێتەوە. دەترسم دەرەقەتی ئەم كارەنەیەم."

– كەیفی خۆتە، بەڵام ئەوە بزانە تۆ بەم شێوەیە باشتر فێردەبیت، پێم باشە ئەم پێشنیازەی من قەبوڵ بكەی، ئەگەر زانیت سەركەوتوو نابی، هەنگێ هەوڵدەدەم كەسێكی دیكەت بۆ بدۆزمەوە. گوێ مەدەیێ، ئەو ماڵە دۆستەی من خەڵكانێكی فرەخاسنو پەشیمان نابێتەوە. مەدام مارگرێتا كیژێكی زۆر زرینگو بە هۆشوگۆشەو روسیەكی باش دەزانێ، حەزیش دەكات فێرە فەرەنسی ببێ. ماڵباتێكی یەجگار باشن.

مورتەزا هێشتاش نەیدەویست بچێتە ژێر بارو نەیدەویست وەڵامی یەكجارەكی بداتەوە. رەجەبۆف ئەمەی بە رەزامەندی حەساو كردو لەسەری رۆیی:

– سبەی نیوەرۆ من لەوێم. تكایە كە لە قوتابخانە تەواو بووی یەكسەر وەرە بۆ ئەوێ. بۆ سبەینێ مورتەزا بە چەند دەققەیەك دوای نیوەڕۆ بۆ ئەوێندەر چوو.

"٢"

هاو ژوورەكەم لە زیندانی كاتیدا، بایەخێكی فرەی بەم یەكەمین دیدارەی مارگرێتا دەدا. بەم یەكەمین دیدارەی كە ئەوی لە بەستەڵەكو جەمەدی رۆژانەی ژیانەوە خستە جوڵەو بەو دوا دیدارە كە ماناو مەبەستێكی بە ژیانی بەخشی. دوایەمین جار كە هاواری لێكردبوو: "مارگرێتا، مارگرێتا، ئەمە بە هیچ كەسێك نەڵێی، بە هیچ كەس." رەنگە دوا دیدار ئەو رۆژە نەبووبێ، لەوەیە دوێنێ بەیانیش كە لە زیندان وەدەركەوتووە، لەبەر دەرگای زندان، لەو شوێنەدا كە ترومبێلان دەوەستنو پاسەوانان كەسوكاری زندانیان دەتارێنن تا نەبادا قسەیەكیان دەگەڵ بكەن، رەنگە لەبەر دەرگا دیتبێتی، رەنگیشە جارەكی دی مارگرێتا جەنازەكەی دیتبێ. مورتەزا ناتوانێ ئەم دوا دیدارە بگێڕێتەوە. بەڵام یەكەمین دیدار، خۆی بۆی گێرامەوە، هەموو هەستو سۆزو گودازو لەزەتێكی خۆی، هەموو پەشۆكانو پەشێوانو خورپەو ترپەیەكی دڵی خۆی بۆ گێراومەتەوە. خۆزیا توانیبام قسەكانی ئەو وەكو خۆی لێرەدا دووبارە بكەمەوە، بەڵكو ئەو كارەی كە لە منی كردووە یان بەلای كەمەوە سێبەرێكی ئەو كاریگەرییە لێرەدا بەرجەستە بوایەتەوە، تا دەربكەوێ كە ژیان، مەینەتیەكانی ژیان، دەردو ئازاران، چتۆ بنیادەم دەكەن بە شاعیرو هونەرمەند. مورتەزا كەسێكی سادە بوو، بنیادەمێكی شەرمن بوو، بەڵام ژیان كردبووی بە شاعیر. هیچ فەرقێك ناكات هەم ئەم دزە بۆگەنە كە هەنووكە لەبەر پێی مندا لە عاردی

خەوتووەو دەپرخێنیٚ، هەم مورتەزا ف، زیندانی مەحکوم بە ئیعدام کە تەواو بووەو براوەتەوە، هەم مارگرێتا کە لە ژێر کێویٚکی دەردو ئازارا گینگلٚ دەداو ورتەی لێوە نایەت، هەم من کە لەم نیوە شەوەدا بە دزییەوە ئەم یاداشتانە دەخەمە سەر کوتە کاغەزان و هەمیشە گویٚ قولاٚغم کە دەنگی نالٚچەی چەکمەی سەر چیمەنتۆی دالاٚنەکەی قاوشی شەشەم لە ژوورەکەی ئێمە نزیک نەبێتەوەو سەدای چرك و هوڕی کلیلی کلیلداری فەلاقە هاتنی ئەفسەری ئاسایش یان موفەتیش رانەگەیەنیٚ، فەرق ناکات! هەر هەموومان کاتیٚ کە دەکەوینە ژێر نیری ئەشکەنجەو عەزابی ژیانەوە، ناچارین لە قە فرتیٚ بکەین، هاوار بکەین، و ئەمە ئەوزاری دەربڕینی هەستەکانمانە، ئەو دلٚۆپە خوێنانەیە کە لە جەرگمان دەڕژێت، پارچەی روحمانەو بەم شێوەیە دەردەکەویٚ. گرینگ ئەمەیە کە ئازارو شادییەکانی خۆمان بە هەر ڕێگەیەك هەیە دەربڕین، بەلاٚم دەردەدار باشتر پەی بە دەردی دەردەدار دەبات.

من کاتیٚ کە بیردەکەمەوە کە چوار سالٚە تریفەی مانگ لە دەرکی دەلاقەوە دەبینم، لە شیش بەندەوە تەمەشای تریفەی مانگم کردووە، کاتیٚ دەبینم، ئەم دزەی کە بەدەم هەر هەناسەو هەر پرخەیەکەوە تۆپەلٚێك بۆن بۆگەنی بەرەلٚلاٚی ئەم ناوە دەکات، وێڕای ئەو دەهەزارو پەنجا هەزارو سەد هەزار تمەنەی کە لە مالٚ و دارایی رەنجبەران و زەحمەتکێشانی ئێرانی دزیوە، چەند رۆژێکی تر بەر دەبێت یان عەفو دەکریٚ و منیش دەبیٚ بۆ چەندین سالٚی دیکە بەشم هەمان دەلاقەو تریفە، هەمان پرخو هۆڕو هەمان ترو تس و هەمان چرك و هۆڕی کلیل و هەمان تەپە تەپی چەکمەو لە هەموو ئەمانەش خراتر شەلاق و جەلٚدەو جنێوو پاشانیش دوورخستنەوەو نەفی کردن بیٚ، بۆیە ئاساییە کە کاریگەریی شرۆڤەی سەمای مەرگەکەی مورتەزا، هەر چەندە وشەکان نارەوان و نا شاعیرانەن، لە مندا زیاترەو هەستی توندو مجێز وخووی ئاگرینی من هەموو دنیا، بەلای کەمەوە دنیای من لە شێوەی سەمای ئیسکەپەیکەری مردووان دا دەبینیٚ. ئاه من مردووەکان دەپەرستم و خۆشم دەویٚن. بە خۆڕایی کەوتمە گێڕانەوەی و ئەم بابەتە، مورتەزا باشتری دەگێڕێتەوە:

" تامن لە قوتابخانەوە سواری گالیسکە بووم و خۆم گەیاندە مالٚی ئەوان چارەکە سەعاتێکی پیٚ چوو. مالٚی ئەوان لە شەقامی نادری بوو. کە دەچووینە حەوشەوە، بە دەستی چەپدا قالٚدرمە بوو دەچووە سەر هەیوانێك، لەوێندەرەوە دەچوویتە ژوورێك کە پەنجەرەکانی رووەو هەیوانەکە دەکرانەوە. کارەکەرەکەیان بەبیٚ ئەوەی لە هاتنی من ئاگاداریان بکاتەوە بردمی بۆ ژوورێکی بچووك، مێزێکی خڕی کورت لە ناوەندی ژوورەکەدا بوووکاغەزیان لە سەردانا بوو. پیاوێکی کاملٚ و کیژێکی گەنج و رەجەبۆفی ئاشنای من لە دەوری مێزەکە دانیشتبوون. هەر کە من وەژوور کەوتم رەجەبۆف گوتی: "ئەها، ئەمە ئاغای (مورتەزا ف)یە. فەرموو، تەشریف بێنە ژوورەوە."

ئەم جۆرە پەزێراییە رێك بە پێچەوانەی حەزو ئارەزووی منەوە بوو، من پێم وابوو دەچمە مالٚی بابایەکی ئێرانی، دەمبەنە ژووری میوان و پاشان یەکێك دێت و قسەم دەگەلٚ دەکات، یان لە بێرونی دا چاوەنۆڕ دەکەم. بە هەرحالٚ باوەڕم نەدەکرد کە راستەوخۆ بمبەنە سەر مێزی نان خواردن، بە سەرو سیمای باوکی مارگرێتادا دیار بوو کە لەم کاتەدا چاوەروانی من نەبووە، یان

بیری چوو بوو کە قەرار بووە کەسێکی واهی بێتو دەرس بە کیژەکەی بڵێتەوە. لە زەینی خۆیدا دەگەڕا تا بزانێ من کێم. دەیویست قسەم لەگەڵدا بکاتو نەیدەزانی چ بڵێ. دەنگی نەرمو ناسکی مارگرێتا وەکو چرکەی زیویێك کە بکەوێتە سەر بەردێك دەنگی دایەوە:

– بابۆ گیان، ئەمە هەمان ئاغایە کە دەخوازێ لای من فێری روسی بێ.

"مارگرێتا چەند ساتێ تێی روانیم. لە جێی خۆی هەستاو پێکەنی. پێکەنینەکەی وەکو هەتاوێك بوو کە لە ژێر هەورەوە سەر دەربێنێ و دنیا نوقمی شادیو خۆشی بکات. چەند تاڵێکی قژی وەکو ئاوریشمی زێرکفت بەحەواوە دەخزی. باڵاو ناو قەدی باریکی کە لە کەمەربەندێکی پاندا بەرزتر دەهاتە بەرچاو، پەرجووی هەم ئاهەنگی بوو. چ خەندەیەکی ناسکی هەبوو، گاڵتەی بە من نەدەکرد، نە گاڵتەی پێ نەکردم. سەراپای بەرنیگایان دەدام. من جانتاو دەستکێشە چەرمەکانم بەدەستەوە گرتبوو، کڵاوو پاڵتۆکەم لە دەرێی ڕا لەسەر کەرەویتەیەك لەبەر هەیوانەکە دانا بوو. دەستی راستم ئازادو ئامادەی تەوقەکردن بوو، رەنگە پێکەنینە شادی بەخشەکەی مارگرێتا زیاتر بەو جانتا زەردە چەرمە گەورەیە بوو بێ کە چاوەڕوانی بوو.

" دەترسام زۆر نیگای بکەم، دەترسام ئاگری ئەو بم سووتێنێ. چاوم بڕی بووە تابلۆیەکی تاڕادەیەك گەورە کە بە دیوارەکەوە هەڵواسرا بوو، چونکە شەرمم دەکردو بیرم لەوە دەکردەوە چۆن لەم چاڵەی تێی کەوتووم بێمە دەرێ، تەنیا ئەم قسەیەم وەبیردا هات:

– ببورن، وا دیارە لە ناوەختا هاتووم. دەڕۆمو جارەکی دی دێمەوە، ببورن.

" کۆتایی زستان بووو پرتە قاڵیان لەسەر مێزەکە دەنابوو. قسەکەم کردو چاوەڕوانم نە کرد. بەڵام کاتێ کە لە قاڵدرمەکانەوە دادەگەڕام گوێم لێ بوو کە بابی مارگرێتا دەیگوت:

– بفەرموو چ قەیدیە، بە خێر هاتی: بەلای کەمەوە پرتە قاڵیك بفەرموو.

" گەییشتمە نێو حەوشەکە. کارەکەرەکە لە بەر دەرکە وەستابوو، دەرگاکەی ڤەکرد تا من وەدەر بکەوم. مارگرێتا وەکو بروسکە بە قاڵدرمەکاندا داگەڕاو لەبەر دەرکە گرتمیەوەو گوتی:

– کەی تەشریف دێنی تا قسە بکەین؟

" زەنگی دەنگی وەکو ئاهەنگی سکەی زیوو بوو، قژە پڕو درێژەکەی بەسەرشانو ملیا ئاوێزان بووو بە پشتی هەردووك گوێیدا وەکو دووکەزیەی پێچاوپێچی درێژ، بە درێژایی دەستەکانیا هاتبوونە خوارێ و لوولیان دەخوارد. چاوە شینەکانی وەکو چاوی پشیلە دەدرەوشانەوە. لە عومراتما کیژی وا خشکۆکم نەدی بوو. دەمی دەتگوت خونچە گوڵی گوڵاڵەیەو دەیەوێ تازە بکرێتەوە. عەتری لە خۆی نەدابوو، مکیاجی نەکردبوو، لێوی سوور نەکرد بوون، گۆناکانی تەڕو بڕ، پێستی وەکو مەخمەل بوو، بۆنێکی هێندە خۆشی لێدەهات گێژی کردبووم. ئارەقەی دنیام کردەوە، زمانم لەگۆ کەوت، کەوتمە زمانە لاڵکێ:

– هاتبووم دەرسی روسی بخوێنم.

– دەزانم، کەی دەڵێی قسە بکەین

– هاتبووم قەول و قەرار بکەین.

– ئەدی بۆ دەڕۆی. فەرموو بچینە سەرێ قەرارێکی لێ بدەین.

"من سوور هەڵگەڕام، بۆی دەرکەوت کە شەرم دەکەم جارێکی دی سەر بکەومەوە".
– کەی وەختت هەیە.
– من هەمیشە وەختم هەیە.
"دەنگە رون و زوڵاڵەکەی وەکو مۆزیقا دنیای ئەفسانەی لە مندا دەنواندو بێدار دەکردەوە."
– ئەمشەو سەعات حەوت تەشریف بێنە.
"ئەوسا تەوقەی لەگەڵ کردم، بە دەنگی بەرز پێکەنی و من لە ماڵی ئەوان وەدەرکەوتم. کاتێ هاتمە کۆڵانەکە، بێویستی خۆم کەڵەموست و قامکی شادەم لێکدی هەڵدەسوو تا بزانم هێشتا هەست بە گەرمی دەستی ساف و ناسکی ئەو دەکەم یان نا، من ئەم دیمەنەی بەر دەرگا فەراموش ناکەمو هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە. لەوەیە چەند رۆژێکی تر..."
مورتـەزا وەختـێ سـەبارەت بـە مارگرێتـا قسـەی دەکـرد، ئیـدی زنـدان و قاوشـی شەشـەمی لـەبیر نـەدەما، لـەبیری دەچوو کە زیندانیـەو لـە قاوشـی شەشـەمدایە. منی لـە بیر دەچوو و لـە تۆ وایـە بـیرەوەری و سـەربهوردەکانی بـۆ خـۆی دەگێڕایـەوە. مـن دڵنیـام کـاتێ باسـی مارگرێتـای دەکـرد هەستی بە قژە زێڕینەکەی دەکرد. هەندێ جار بۆ چەند دەقیقەیەك بێدەنگ دەبوو، ئەوسا ئەگەر هێشتا لە دنیای خەیاڵدا بوایە لەسەری دەڕۆیی یان دەیگوت: "فایدەی چییە؟ ژیان چـەند شـیرین و چەند تاڵە. چەند تاڵە، باشە. جارێکی دی بۆتی باس دەکەم".
ئیدی من چاوەنۆڕی دەرفەت بووم.
لە زستاندا سەعات چوار و نیو دەیانکردینە ژوورەوە. ئەوپـەڕی رۆژی پێـنج سـەعاتێك لـە دەرەوە دەبووین، لە ژوورەوە یەکێك خۆی دەدۆزی، یەکێك شۆرتەکەی بە پەنجەرەوە هەڵدەواسی، یـەکێك باوێشـکی دەدا، یـەکێك گـۆرانی دەگـوت، یـەکێك گۆرەوییـەکانی پینـە دەکـرد، بۆیـە زاتم نـەدەکرد رووی لێ بنەم کە جوانترین هەستی خۆی بۆ من شرۆڤە بکات و چاوەنۆڕ بووم تا جارێکی دی لە گێمـی چوونە دەرەوەماندا ئەگـەر تەفتیشـیان نـەکردباین، ئەگـەر تـەپوتۆزی تەکانـدنی کەلوپـەلی زندانیان رێگەی دابایەن، ئەگەر پاسەوانێکی تازە پەڵپ و بیانووی سەماوەرو چای لێنـەگرتباین‌و لێمان نەبوایە بە مووی لووت، فرسەتێ بێنم و ئەو گێولی هەبێ کە سەربوری بەدبەختی خـۆیم بـۆ بگێڕێتەوە.
"ئەو شەوە سەعات حەوت رۆیشتم، نازانم بۆچی وێڕای ئەوەی کە کـارم زۆر بـوو، سـەعات پێـنج چووم بۆ ماڵەوەو خۆم وەکو ئەو منداڵانەی کـە دەخـوازن بچـنە میـوانی، ئامـادەو تـەیار کـرد. هـەر چەند بەیانی ردێنم تەراشی بوو، دوای نیوەڕۆش تەراشـم کـردەوە. جلکێکـی کـەوەییم هـەبوو کـە زۆر جـوان‌و بـاش دروا بـوو، لەبـەر کـرد، قەرەویتەیـەکی کـەوەیی خـاڵ خـاڵی سـوورم بەسـت، پاڵتۆیەکی نێوقەد تەنگم کە ئەو دەمە مۆدی بوو لەبەر کردو سواری گالیسکە بووم. بـە درێـژایی رێگەکـە دڵـم لێـی دەدا. هـەزارو یـەك بـیری شـیرینم بـە مێشـکدا هـات، داهاتوویـەکی پرشـنگدارم لەبـەردەم خـۆدا دەبـینی، بـەڵام بـاوەڕم نـەدەکرد، جـار جـارێ جـوانی ئەنـدام و ناسـکی پێسـتی مارگرێتـام وەبـیر دێنایـەوەو دەمگـوت: "نـا، مەحاڵـە". هەنـدێ جـار خەنـدەو پێکەنینەکـەیم بـیر دەکەوتەوەو زایەڵەی دەنگیم دەژنەوت و دەمگوت: "قەشمەریم پێدەکات" بۆچی پێـێ دا دە گـرت

که ئەمڕۆکە بێم، بۆچی؟ بۆ ئەوەی لە منەوە فێری فەرەنسی بێ. خۆیشم نەمدەزانی چیم گەرەکە بەڵام هەموو  ئەم خەیاڵاتە شیرین بوون.

چەند دەققەیەك بەر لە سەعات حەوت لەبەر ماڵەکەیاندا دابەزیم، لە پڕ دڵم کەوتە ترپە ترپ، هەستم کرد هەڵبەتە تێدەگەن کە من لەبەر چوونم بۆ ئەوێ وا خۆم رازاندووەتەوە. بە دەستە سڕ بۆدرەکەی دەموچاوم سڕی. بە دەست هەندێ قژم شێواند تا دیار نەدات کە تازە شانەم کردووە، جوان نییە وا هەست بکەن کە من بە تایبەتی بۆ دیداری ئەوان خۆم تەیار کردووە. دەمویست پێڵاوەکانیشم کەمێك خۆڵاوی بکەم کە لە پڕ دەرگای ماڵێك کرایەوە. من بەو خەیاڵەی کە دەرگای ماڵی ئەوانە، رەنگم تێك چوو، بەڵام خۆشبەختانە دەرگای ماڵی دراوسێکەیان بوو. لە زەنگم دا. کارەکەرەکەیان دەرگای ڤەکرد. هەر کە پێم نایە ناو حەوشە، بابی کە لەبەر هەیوانەکە وەستابوو، لە قاڵدرمەکانەوە داگەڕاو پێی گوتم: "فەرموون فەرموو وەرە سەرەوە. هەندێك لەگەڵ کیژەکەمدا قسان بکەن، ئێستا شیڤ ساز دەبێت". لەهجەکەی ترکیەکی گڕ بوو، گوتم:

– سوپاس، بەڵام من شیوم خواردووە.

– فەرموو سەرێ. هەر کەسێك بێتە ماڵی ئێمە دەبێ شیڤ بفەرمووێ. جا تۆ حەز دەکەی مەخۆ.

ئەمەی گوت و رەوانەی کردمە سەرێ، چوومە ژوورەوە مێزێکی گەورە لە دوو ژوورەوە بوو. گڵۆپێك بە دیار مێزەکەوە، بە میچەکەوە هەڵواسرا بوو، چەترێکی تۆخی بە پلێپلەو سلسلەی مەنجوخی بە دەورەوە بوو. ژوورەکە نیوە رووناك بوو، پەردەی ئەستوورو قورس سەرووی پەنجەرەکانی سەر حەوشەی داپۆشی بوو. لە گۆشەی چەپاو دوور لە هەیوانەکە پیانۆیەکی گەورە دانرا بوو، و لەلایەکییەوە گرامافۆنێك و لەلایەکەی ترییەوە رادیۆیەك دانرا بوو. مارگرێتا جلکێکی شینی کاڵی لەبەردا بوو، یەخەیەکی چین چینی گەورەی هەبوو، کە لە ناوەڕاستیاو لەسەر سینگی قردێلەیەکی سوری پەپولە ئاسای گرێ دابوو. نازانم روناکی گڵۆپەکە بوو یان رەنگدانەوەو کاریگەری چەترە سورەکە بوو، یان گرێی سوری سۆپا نەوتیەکە بوو یان پەردە ئەستوورو قورسەکان بوو یا رەنگی رەشی پیانۆکە بوو، بە هەر حاڵ مارگرێتا رەنگ بزرکاو هاتە بەرچاوم، نەك بڵێی کە گۆناکانی پەمەیی نەبوون بەڵام لەبەر چاوی منا ئەم مارگرێتایە دەتگوت هەزار هێندەی نیوەڕۆ جوانتر بووە. مارفینکا لەم لای پیانۆکەوە وەستا بوو. مارفینکا دەسەخوشکی مارگرێتا بوو. ئەمانە بە دوو قۆڵی و پێکەوە بە روسی قسانیان دەکرد. ئەمە کیژە روسێك بوو کە لە ئێران لە دایك بوو بوو، بابی مردبوو لەلای دایکی کە شووی بە پیاوێکی ئێرانی کردبووەوە، دەژیا.

کاتێ من وەژوور کەوتم مارگرێتا دەستەیەکی نۆتەی پیانۆی لەسەر کورسیەك هەڵگرت و لەسەر تەپلەکێکی تەنیشت پیانۆکەی دانا: "لە وەختێکی باشدا هاتی، ئەم دەستە خوشکەم نا ناسیت؟ مەدام مارفینکا".

یەکەمجار خۆی تەوقەی دەگەڵ کردم. ئەوجا من تەوقەم لەگەڵ مارفینکادا کرد. ئەوسا مارفینکا خواحافیزی کردو رۆیی، من و مارگرێتا بە تەنێ لە ژوورەوەماینەوە.

– هەوەڵجار شیڤ دەخۆین، پاشان سەبارەت بە کارەکەمان قسە دەکەین.

- من شیڤم خواردووه.

- قەیدی نیە، کەمێکیش لەگەڵ ئێمەدا بخۆ... چاوەڕوانین تا ئاغای رەجەبۆف بێت.

چەند قسەیەکی دەکرد، ئەوجا بەوپەڕی سادەیی سەیری منی دەکردو چاوەڕوانی وەڵامی من بوو.

- هەمیشە درەنگ دێت. باشتر.

قسەی دەکردو پێدەکەنی. دەنگی پێکەنیناوی نەبوو، وەکو ئەو ئاهەنگانەی کە لە تەلی تارەوە دەردەچن ماوەیەك لە هەوادا دەلەرییەوە. ئەو قسەی دەکرد و چاوەڕوانی نەدەکرد کە من وەڵام بدەمەوە: "تۆ بۆ ئەوەندە شەرمنی؟ بابۆ بنیادەمێکی باشە دەتوانی رەفیقایەتی لەگەڵ بگریت. تەمەنی لە پەنجا پتر نییە، بەڵام روحی گەنجە. قەلەندەرە هەمیشە نەخۆش و توڕەیە. حەز ناکەم کە دارعاسا هەڵدەگریٚ. تەمەنت چەندە؟".

چاوەڕوانی وەڵامی من بوو، بەڵام من نەمدەزانی بەچی بانگی بکەم. ئەگەر ناوەکەی فارسی بایە، بە ئاسانی دەکرا بڵێی: ئەختەرخانم یان پەروانە خانم بەڵام مارگرێتا خانم قورس دێتە بەر بای گویٚ. مەدامیش خۆش نیە، چونکە ئێمە بە فارسی قسە دەکەین. بەڵام هێشتا باشتر بوو"من بیست و پێنج ساڵم مەد... مەدام"

- پێم مەڵێ مەدام، زۆر فەرمی دەردەچیٚ. هەر کاتیٚ فەرەنسی فێر بووم، هەنگیٚ بە فەرەنسی قسەت دەگەڵ دەکەم، و ئەوسا دەتوانی پێم بڵێی مەد موزیل، باشم گوت؟ من تۆزێك فەرەنسیم لای خۆم خوێندووە، بەڵام ئیتر تۆ باشم فێر دەکەی. من روسی باش دەزانم. دایکم روسی بووە. مەبەستم ئەوەیە کە روسیە، ئێستاش ماوە.

ئەوسا چوو بۆ سووچی ژوورەکە لە ژێر مێزێکدا ئەلبومێکی دەرهێنا، گوتی: "فەرموو با لێرەدا وێنەکەیت نیشان بدەم. تەمەشا چەند خشیکە، نازانم ئێستا لە کوێیە. لە ئێران نیە، بەڵام من زۆرم خۆش دەویٚ. لە ژوورەکەی خۆمدا وێنەیەکی گەورەی دایکم هەڵواسیوە، مەخابن کە من لە جەم ئەو نیم".

وێنەکەم لە دەستی وەرگرت و تەمەشام کرد. راستی دەکرد ژنێکی یەجگار خشکۆك بوو. لیٚ من ترسم لیٚ نیشت. نەبا بخوازیٚ ژووری نووستنەکەیم نیشان بدات. گوتم: "لەم وێنەیەشدا دیارە کە ژنێکی یەکجار جوانە".

- ئێستاش هەندیٚ جار کاغەزم بۆ دەنووسێت. باوکی زۆر خۆش ویستووم. هەمیشە ئامۆژگاریم دەکات کە ئاگام لێی بیٚ.

حەزم دەکرد لێی بپرسم کە هۆی جیابوونەوەیان چیە بەڵام زاتم نەکرد. مارگرێتا لەسەر قسەکەی رۆیی:

- وا نەزانی کە روسیم لە یاد چووە. من هەموو رۆژیٚ سەعاتیٚ دووان بە رووسی قسان دەکەم.

پرسیم: "لەگەڵ کێدا؟".

- دەگەل مارفینکادا. زۆر رەفیقین. پێکەوە مۆزیقا لیٚ دەدەین. بە دوو قۆڵی پیانۆ لێدەدەین. ئەگەر حەز بکەی، شەوێك دەعوەتی دەکەم و پێکەوە مۆزیقات بۆ لێدەدەین. کیژێکی زۆر چاکە.

هـەر قسـەی دەكـردو پێدەكـەنی، هەنـدێ جـاریش رووی دەكـردە مـن و شـتێكی دەربـارەی مـن دەگوت و لێی دەپرسیم: "حەز لە كتێب خوێندنەوە دەكەیت؟".

یـان: "لـە نووسـەرە روسیەكاندا كامیانـت لـە هـەمووان خۆشـتر گەرەكـە؟"و یـان: "مـن دڵبەسـتەی پوشكینم، ئەو لە هەموو كەسێك زیاتر پەی بە پێداویستی و ئازارەكانی بەشەر دەبات".

سـەرم دەسـوڕما لەمـەی كـە ئـەم كیـژە بـەم هـەموو جـوانی و نازدارییـە بۆچـی نـاوی ئـازارو پێداویستیان دەبات.

بە دەم خەندەو پێكەنینەوە لەسەری دەڕۆیی و

– گەرمات نییە؟ سۆپاكە كەمێك كز بكەم.

گەرمام نەبوو.

– نەتگوت كە مۆزیقات حەز لێیە یان نا؟

هەڵبەتە حەزم لە مۆزیقا هەبوو.

– ئەگەر دەتەوێ با بۆت لێدەم، بـەڵام بـا هـەڵیگرین بـۆ دوای شـیڤ، رەجـەبۆف حـەزی لـە مۆزیقا نییە، لەگەڵ بابمدا شەترەنج دەكـات، هەڵبەتـە ئەگـەر عـارەقی نەخواردبێتـەوە. ئەوسا پیـانۆت بـۆ لێ دەدەم. چ جۆرە مۆزیقایەكت حەز لێیە؟ لێ هەندێ جاریش چاوەنۆڕی وەڵامـی مـنی نـەدەكرد. بە دەم خەندەوە لە سەری دەڕۆیی.

مـن نقـومی ئـەو ئەفسـوونە بـووم كـە لـەوەوە بەسـەرما دەرژا. دەمڕوانیـە بزاوتـی لێـوە تـەنك و ناسكەكانی. من غەرقی ئـەم هـەموو جوانیـە سـەر رێـژە بـووم. مـن ئاهـەنگی پـڕ جۆشـی قسـەكانیم هەڵدەمـژی. بـۆی ئـەو گـەرماو روناكیـەم دەكـرد كـە لـەوەوە دادەچـۆڕا. تـامی لـەزەتی جـوانیم دەچەشت. هەستم بە مەستیەكی زۆر، دابڕان، و حەپەسان لە خۆدا دەكرد.

مـن چـوو بوومـە دنیایـەكی تـازەوە، دنیـای دەرێـی هـەمووان، دنیـای دەرێـی خـۆم، دەرێـی دنیـای رۆژانەو یەكهاوی. لەم دنیایەدا ئومێدو هێڤیان هەبوو، لەم دنیایـەدا بەشـەر نەیـدەزانی كـە سبەی چ دەقەومێ، لەم دنیایـەدا مـرۆڤ عـەزرەتی هەڵدەكێشـا، لـەم دنیایـەدا مـرۆڤ دەردو ئـازاری دەكێشا بەو ئومێدەی كە لە دوای ئەوە خۆشی و لـەزەت هەیـە. مارگرێتا بۆچـی پێدەكـەنیٚ؟ قەشمـەری بـە من دەكات، رەنگە وانەبێ. لەوەیە خۆشی بە مندا هاتبێ. دەبینە دۆسـتی یـەكتر. لەوەیـە رۆژێ لـە رۆژان، زەڕەیـەكی خـۆش بـوێم. هـەنگێ هـەموو ژیـانی مـن بـۆ ئـەو، هـەموو بوونم فیـدای ئـەو بـێ، چەند ناسك قسەی دەكرد. من زاتم نەدەكرد هیچی لێ بپرسم. لـێ لـە دڵـی خـۆدا بیرم دەكـردەوە: "مارگرێتا، تۆ چۆن بیر لە من دەكەیـەوە؟" جـوانی ژیـان لـەم نەزانینـەدایە، لـەم هیـواو ئومێدەدایـە كە سبەینێ باشتر دەبێت. دنیا هێدی تر، جوانتر دەبێت.

ئەوسا بابی هات: "ئاغای ف هیچ قسە ناكات. لەو ساوە هەر من قسەم كردووە"

– ئێ ماری، بۆچی زۆرت قسان كرد؟ خۆ ئەگەر قسەت نەكردبا، هەنگێ ئاغای ف قسەی دەكرد.

ئەوسا بابی رووی كردە من: "جەنابت مامۆستای؟"

– بەڵێ.

– چەند ساڵە دەرس دەڵێیتەوە؟

ئێمە پێکەوە وەکو چۆن دوو پیاو پێکڤە قسان دەکەن، قسەمان کرد، دوایی رەجەبۆف هات، لەسەر شیڤو پاش شیڤش قسەمان کرد. سەبارەت بەکاری من، دەربارەی ئایندەی منو وەزعو حاڵی دنیا؟ تازە لەو سەرو بەندەدا پەیمانی مونیخ بەسترا بوو. سەبارەت بە جەنگو بەمەی کە ئەڵمانیا ئیختراعێکی کردووە کە ئەگەر هەموو دنیا یەك بگرن، کۆنترۆڵیان دەکاتو ئیدی جەنگ نابێ. رەجەبۆف بە تایبەتی پێی لەسەر ئەمە دادەگرت کە ڕژێمی روسیا هەر دەبێ نەمێنێو لە ناو بچێت. بۆچی دەستیان بەسەر کارخانانی خەڵکیدا گرتووە؟ بۆچی ئەو پێنج خانووەی کە ئەو لە باکۆدا هەی بوون، نایدەنەوە. خانووەکانی ئەویان داگیرکردووەو قوتابخانەیان لە جێی دروست کردووە. ئەو باخەی لە بابیەوە بۆی مابووەوە ئەمڕۆ کراوە بە پەروەردگەی منالان، لەوەتای دنیا دنیایە ئاغاو نۆکەر، دەوڵەمەندو هەژار هەر هەبووەو هەر دەبێ. لە هەموو ئەمانەش خراتر ئەوەیە کە بازرگانی نیە. پیف! مەملەکەتی بێ بازرگانی بۆچی باشە. تەرەقی مەملەکەت بەندە بە دەوڵەمەندی بازرگانەکانیەوە. تاقەیەك بازرگانی روسم پێ نیشان بدەن. و زۆرشتی دیکەی لەم بابەتە.

هەنگێ مارگرێتا هەڵیدایێ

– بابۆ، چەند باسی سیاسەت دەکەن؟ من دەمویست کەمێك پیانۆ بۆ ئاغای ف، لێ بدەم، ئێوە ئەگەر گوێ ناگرن، بۆ خۆتان شەترەنج بکەن.

ئێمە بە دووقۆڵی چووینە ژوورەکەی تەنیشتەوە. چونکە پیانۆکە لەو ژوورەدا بوو. ئەو هۆدەیەی کە نانمان تیاخوارد، هەمان ئەو ژوورەبوو کە یەکەمجار مارگرێتام تێدا بینی، لێ دەرکەی مەعبێنی ئەم دوو ژوورە وازبوو، بە جۆرێ کە ئەگەر کەسێك لەسەر مێزەکە وەستابا بە ئاسانی دەیتوانی قسە دەگەڵ دانیشتووانی ژووری نان خواردن دا بکات. مارگرێتا لێی پرسیم: "حەزت لە چیە؟ موزیقای سووك یان قورس؟"

شەرمم کرد بڵێم جیاوازی نێوان ئەم دووە نازانم، بە خەیاڵی خۆم مارگرێتا وەکو جاران چاوەڕوانی وەڵامی من ناکات. بەڵام بە دەم هەڵدانەوەی لاپەڕەی نۆتەکانەوە، هەڵوەستەیەکی کردو گوتی: "شتێك بڵێ".

– بە کەیفی خۆت.

– یانی حەزت لە مۆزیقا نیە؟

– بۆ نا، زۆریش.

بابی گوتی: "شتێکی باشی، شاد لێ بدە، خەمگین نەبێت".

رەجەبۆف گوتی: "ئەگەر بیەوێ (سەمای مەرگ – Dance macabre) لێ بدات، من هەڵدێم".

مارگرێتا پرسی: "بەڕاست،ئاغای ف –Macabre– یانی چی؟

من شپرزە بووم. لە تۆ وایە دەیەوێ تاقیم بکاتەوە. Macabre واتە شوم، macabre واتە ترسناك، واتە ئەو کپییە سامناکەی کە باڵی بەسەر مردو شۆرخانەکاندا، بەسەر گۆڕستانەکاندا کێشاوە. من ناتوانم هاوتایەکی دەقاو دەق بۆ ئەم وشەیە بدۆزمەوە.

مارگرێتا گوتی: "هۆو، ترس لە بنیادەم دێنێ. مۆزیقاکەشی هەر هەروایە".

ڕەجەبۆف گوتی: "منیش هەروام گوت".
مارگریّتا بە توندی پەرسڤی دایەوە: "نەخێر، تۆ وات نەگوت، تۆ شتێکت گوت و باقیەکەیت بە ئیشارەی دەست نیشان داو من هیچ حاڵی نەبووم".
سەرە ڕوتاوەکەی ڕەجەبۆف سور هەڵگەڕا. دیار بوو لە حوزوری مندا بە تەمای هێرشێکی واهی نەبوو. ئیدی بۆم دەرکەوت کە مارگریّتا نای حوبێنیّ، وەك بێژی ئەم ڕاستیە سوکنایی بە دڵی من بەخشی.
ئەوسا مارگریّتا چووە سەر پیانۆکەو ماوەیەك پیانۆی لێدا. نەرمی و ئارامیەکم تیّ گەڕا، حەزم دەکرد هەموو دنیا میناکی من بەختەوەر بوایەو لەزەتی لەم دەستە ناسکانە بدیبا کە بەم سەلاری و مەنگییە لەم دەزگا جادوییەوە ئەم ئاهەنگە ئەفساوناویانەی دەردێنا. حەزم دەکرد ڕازو نهێنییەکانی مارگریّتا لە چاوەکانیا بخوێنمەوە. چی لێدەدا نازانم لیّ ئاوازو ئاهەنگەکان دەیان سوتاندم، لە دڵمدا کڵپەیان دەسەند، خوێنم هاتبووە کوڵ و جۆش و خۆم بە بەختەوەرترین خەڵقەندەی دنیا دەزانی.
ئەو شەوە تا کەنگیّ لەوێندەر مامەوە، بیرم نییە. بە هەر حاڵ دێر بوو بوو، ڕەجەبۆف دەگەڵ بابی مارگریّتادا لە ژوورەکەی تەنیشتمانەوە دانیشتبوو. ئاخری ڕەجەبۆف هات تا خوا حافیزی لە من بکات و بۆم دەرکەوت کە دەبیّ منیش هەستم.
قەرارمان وا کرد کە هەفتەی شەش شەو بچمە ئەوێندەر. شەوێك من فێری ڕوسی ببم و شەوێك من دەرسی فەرەنسی بەو بڵێم، ئەمە یەکەم دیداری من و مارگریّتا بوو، لەو شەوە بە دواوە زۆربەی کات، واتە هەموو شەوێك تا سەعات دەو یانزە هەندیّ شەوانی هەینی نەبیّ، لەگەڵ ئەودا بووم.
پێویست بە گوتن ناکات کە ئیدی ژیانی من گۆڕا، شێوەیەکی تازەی لە خۆ گرت. هەموو زیکرو فیکری من تەنیّ ئەمە بوو کە: چ بکەم تا بچمە دڵی مارگریّتاوە، جارێك پێی گوتبووم کە حەزی لە ڕەنگی شینباوە. ئیدی من تەنیا کراسی شینم لەبەر دەکرد. هەموو بێجامەکانم شینی کاڵ بوون. جارێکی دی پێی گوتم: "بە ڕای من ڕەنگی قاوەیی لە قژی ڕەش و چڕو ڕەنگی ئەسمەری تۆ دیّ".
ئیدی من جلکی قاوەیی ئامال سوورم لەبەر دەکرد. جارێك لە سەرەتای ڕۆژانی ئاشنایەتیماندا گرێی قەرەوتیەکەی بۆ ڕێك خستم و توندی کردەوە، ئیدی من بۆ هەمیشە ئەمەم کرد بە ئاڵقەو لە گوێم کرد.
ئەو حەزی لە مۆزیقای قورس و بەرز دەکرد، من بەمە ڕانەهاتبووم، بەڵام هەوڵم دەدا زەوقی خۆم لەم ڕووەوە پەروەردە بکەم. بەکرەی گرامافۆنم دەکڕی، چەندین کتێبم دەربارەی مۆزیقا کڕی و خوێندەوە، تەنانەت شەرمم لەوەش نەبوو کە هەندیّ شەرح و شرۆڤان لە خودی مارگریّتا بپرسم.
ئەو حەزی لە چارەی ڕەجەبۆف نەدەکرد، منیش بە چاولێکەری ئەو حەزم لێی نەدەکرد. تا پتر شەیداو دڵبەستەی مارگریّتا دەبووم پتر لەو دڕدۆنگ دەبووم. شەوێك پاش ئەوەی دەرسمان تەواو بوو، داوای لە مارگریّتا کرد کە کەمێك پیانۆ لیّ بدات. مارگریّتا نیگایەکی منی کرد.

پێویست بەوە ناکات بڵێم کە ئەو شەوە، خۆشترین شەو بوو کە من لە ژیانما لە ئازادیدا رام بوارد، ئەو نیگایە مانای نەبوو. دەیویست بە من بڵێ: "من ماندووم، بەڵام ئەگەر تۆ حەز دەکەی ئامادەم لەبەر خاتری تۆ، چونکە تۆم خۆش گەرەکە، مۆزیقا لێ بدەم و ئەگەر تۆ نەتەوێ، ئامادەم تەنانەت داوای ئەم رەجەبۆفە عارەقخۆرە رەت بکەمەوە."نەخێر وا نەبوو، من ئەم مانایەم لە نیگاکەی ئەوەوە هەڵێنجا. نەخێر ئەمە ماخۆلانێك بوو تووشی من بوو بوو. من وام خەیاڵ دەکرد کە خۆشم گەرەکە، من ئەم نیگایانەم بەدڵی خۆم لێکدەدایەوە. چەندین رۆژ، چەندین شەو، هۆش و بیری من تەنیاو تەنیا بە دەوری ئەم نیگایەدا دەسوڕایەوە، منیش تەمەشای ئەوم کرد، بەڵام دەرم نەبرد، لەپڕ دەماری نێوان هەردوو بڕۆم بەرز بووەوە، هەموو ئەم دنیایەم هاتە بەرچاو. مارگرێتا یان شەکەت بوو یان نەیدەویست داواکەی ئەو بەجێ بێنێ. مارگرێتا لە بەرسڤدا گوتی: "من ماندوو بووم بە چاوان دوایی بۆتان لێدەدەم".

هەمدیس داوای لێکردەوە، بە رادەیەك کە لەزگ بوو رەجەبۆف زویر بێ، هەنگێ بابی مارگرێتا ناچار بوو بکەوێتە بەینەوە. ناچاری کرد لە پشت پیانۆکەوە دانیشێت.

من پەست بووم، بەڵام پێم سەیر بوو کە چۆن رەجەبۆف لە ناکاودا ئەوەندە زەوقی چووەتە سەر مۆسیقاو تەنانەت پێم وابوو کە بەڕاستی پێویستی بە مۆزیقایە. چەند بێزار بووم کاتێ بینیم کە لەو کاتەدا کە مارگرێتا ئالۆزو تووڕە، تەپەتەپ بەر بوو بووە پیانۆکەو چەند دەققەیەك بەردەوام بوو، ئەو سیو دوو دانە جار باوێشکی دا، نۆ جاریان بیری چوو دەست بە دەمیەوە بگرێت و نزیکەی یازدە جاریش ئاو بە چاویا هاتە خوارەوە.

کە مارگرێتا لێ بووەوە گوتی: "ببورن باشم لێنەدا".

پاشان لە ژوورەکە چووە دەرێ. نزیکەی نیو سەعاتێکی پێچو، ئەوسا پاڵتۆکەی لەبەر کردو هات خوا حافیزی لە من بکات، رۆژی هەینی بوو و دەیویست دەگەڵ مارفینکادا بۆ سینەما بڕوات. منیش رابووم و پێکڤە لە ماڵ هاتینە دەر، مارفینکا لە حەوشەدا وێستا بوو، من تا بەر سینەماکە لەگەڵیان چووم. لە رێگەدا پێی گوتم: "ئەمشەو زۆر خراپم لێدا، من کاتێ ناچار دەبم، ناتوانم باش لێ بدەم".

– ئاگام لێ بوو کە تووڕە بوویت.

– کە ناچار دەبم ناتوانم باش لێ بدەم. لە تۆڵەی ئەمەدا رۆژی هەینی داهاتوو مارفینکا دوای نیوەڕۆ بۆ ماڵی ئێمە دێت، بە بابیشم گوتووە. ئەو رازیە، دەگەڵ مارفینکادا پێکڤە بە چوار دەستی سەمای مەرگت –Dane macabre بۆ لێ دەدەین.

یەکسەر بیرم کەوتەوە کە هەمدیس رەجەبۆف لەوێ دەبێ و هەمدیس بە باوێشکان تووڕەو پەستم دەکات، بۆیە لێبڕام کارێك بکەم کە تا ئەوساکە نەم کردبوو.

– ببوورە، من ئەم هەینییە کارم هەیەو ناتوانم بێم.

– چۆن، کاری چیت هەیە؟

مارگرێتا سەری سوڕما. ئەمە یەکەمجار بوو کە من داوای ئەو رەت بکەمەوە.

مارگرێتا هەستی کرد کە نیازێکم هەیە، ئەو ڕۆژەمان بە بێدەنگی گوزەراند. دوای چەند ڕۆژێك کە هەر هەردووکمان بووین، لێی پرسیم: "بۆچی ئەو شەوە دەعوەتەکەت ڕەت کردمەوە؟"
– تۆ نازانی بۆ؟ تۆ ئەوە شەوە کە مژولی پیانۆ لێدان بووی قیافەو سیمای ڕەجەبۆفت نەبینی. تۆ بەم ئاوازانەت وێنەیەکی تازەی ژیان بە من نیشان دەدەی، من نامەوێ ئەم بەختەوەری و شادیە بە خۆڕایی لە کیسی خۆم بدەم. دەمێ بوو پێوە بووم داوات لێ بکەم ئەم (سەمای مەرگەم – Dane macabre) بۆ لێ بدەیت.
– ئەدی بۆچی دەعوەتەکەی منت ڕەت کردەوە؟
– مەرجم ئەوەیە کە ئاغای ڕەجەبۆف لەوێ نەبێ.
– پێم وایە غیرە دەکەی.
سور هەڵگەڕام‌و نزیك بوو چاوانم پڕ لە رونداك بن، لێ خۆم گرت. ئەم گفتوگۆیانە بەدەم دەرس خوێندنەوە کران. چونکە بە فەرەنسی قسەم دەکرد، پرکێشیەکی زیاترم هەبوو، مارگرێتاش ئەوەندەی دەیتوانی بە فەرەنسی‌و باقیەکەی بە فارسی دەگوت. ئەمە یەکەم کەڕەت بوو کە مارگرێتا ئەگەرچی بە شێوەیەکی تەوس ئامێزش بوو، ئاماژەی بۆ هەست و سۆزی من دەکرد.
– نە، غیرە ناکەم، بەڵام کە تۆ پیانۆ لێ دەدەی، من باوێشکەکانی ئەوم پێ تەحەمولْ ناکرێ.
– دڵنیابە کە منیش لەم زەلامە بێزارم، بەڵام قەبولْ کردنی ئەم مەرجە بۆ من زەحمەتە، هەوڵدەدەم بە گوێرەی حەزی تۆ ڕەفتار بکەم، هەوڵدەدەم بە دڵی تۆ بکەم، تۆ ئاگاداری هەموو وردو درشتێکی پەیوەندی بەینی ئێمە نیت. پێویست ناکات. من چاوەڕوانی دەرفەتم.
"بەڵام ئەم دەرفەتە ماوەیەکی زۆر هەر نەڕەخسا. تا شەوێك کە لەگەڵ مارگرێتا و بابیدا لە سینەما بووین، تووشی مارفینکاو دایکی بووین و پێکەوە چووینە کافەی (ئوستریا). ئەو شەوە دیسان باسی داواکەی من کرا، من هەمدیس مەرجەکەی خۆم دووبارە کردەوە.
ئەوەی ڕاستی بێ من دەمویست جارێك مارگرێتا بە ئازادی بدینم، دەمویست لە ژێر کاریگەری و گوشاری ڕەجەبۆف دا نەبێت. دەمویست بزانم کە مارگرێتا کاتێ ئەسیری هەست و سۆزی خۆیەتی چۆنە، چونکە دەمزانی کە سەمای مەرگ – Dane macabre لە هەر هەموو شتێك پتر کاری لەوە کردووە، حەزم لێ بوو کە لە ژێر گوشاری ئەم پارچە مۆسیقایەدا بێ، دەمویست بزانم کە مارگرێتای ڕاستەقینە چۆن هەست دەکات".
لێرەدا من مەجبور بووم بە پێچەوانەی ڕەوتی ئاسایی خۆمەوە قسەکەی مورتەزا ببڕم و لێم پرسی: "من لە یەك شت باش حاڵی نابم. وێڕای ئەم هەموو جۆش و خرۆش و سۆزو گودازەی کە لە تۆدا هەبووە، مارگرێتا هیچ کاردانەوەیەك، هیچ نیشانێك، هیچ شتێکی، ئاخر مەیلێ یان بێ مەیلییە، بێزارییەکی نیشان نەدەدا، چونکە خۆشەویستی تۆ بتەوێ و نەتەوێ لە هەموو هەڵس‌وکەوتی تۆدا دیار بووە، ئەمە قسەی لەسەر نییە".
"من خۆشم دەویست و ئێستاش خۆشم گەرەکە، ئاخر بۆیە ئێستا مەرگ بە ئاوات دەخوازم. مەبەستت ئەمەیە کە مەبەستی من چ بووە، چم دەویست. ئایا ئەویش منی خۆش دەویست، نە، هیچ کاتێك دەری نەبڕی، نیشانەو هێمایەکی بە من نیشان نەدا: وەکو دوو هاوڕێ بووین. بەڵام

پەیوەنـدیمان لـەم ئاسـتە سـەرڤە سـەرڤەیە تـێ نەپـەڕی. پەلـە مەكـە؟ وەڵامـی ئـەم پرسـیارەت دەدەمەوە. تۆ نازانی چەند خۆشە پیاو بتوانێ لـە خـۆ بردوویـی هـەبێ، فیـداكاری بكـات، لـە رای فكرێك، ئارەزوویەك، لەڕای ئیمانو باوەڕێك، لە پێناوی هەرشتێك دا كە شایستەی ئەوەبێ ژیانی لەسەر دابنەی. ئەم ژیانە پڕ بێزاریو یەكهاویو رۆتینییەی من چ نرخێكی هـەبوو. ئامادەیی بۆ مەرگ بوونی ژیان خۆش دەكات. بەڵام مارگرێتا چ كاردانەوەیـەكی هـەبوو؟ ئێستا باسـی دەكـەم، ئێمـە بـەدەم دەرسـی روسـیەوە بـەرە بـەرە هاتبووینـە سـەر كتێبـانی روسـی. مـن تكـام لێ كردبـوو هەنـدێ بەشـی "یـەڤگینی ئـونیگین"ی پوشـكین لـەلای مارگرێتـا بخـوێنمو ئـەویش قاییـل بـوو. هەرچەندە تێگەیشتنی بۆ من زەحمـەت بـوو، لێ چونكە باجڤە فەرەنسییەكەیم خوێند بووەوە بە ئاسانی دەمتـوانی پـەیگیری بابـەتو نێوەرۆكـەكانی بكـەم. و بـەردەوام بم لەسـەری. كـە گەیشـتینە سـەر نامـەكاری تاتیانـا، ئەوەنـدە كـاری تێكـردم دەتـوانم بڵـێم جڵـەوی خـۆم لـە دەسـت دەرچـوو. مارگرێتـا هەسـتیكرد كـە ئـەم نامەكاریـە زۆر كـاری تێكـردومو گـوتی: "تاتیانـام خـۆش گەرەكـەو حەزم دەكرد وەكو ئەو بووایەم."

گوتم: "تۆ هەرگیز نەتدەتوانی وەكو تاتیانا بی. كـێ دەتـوانێ وەكو تاتیانا فیداكاری بكاتو لـە خۆ بوردەییەكی واهی نیشان بدات، بەرانبەر بە پیاوێك كە ئەو پیاوەی خۆش دەوێ، بە ئاشكرا ئیعتراف بكات كە من تۆم خۆش گەڕەكە. تاتیانا وا مەزەندە دەكات كە ئەم پیاوە ناتوانێ وەڵامی هەسـتو سـۆزەكانی ئـەو بداتـەوە، یـان نایـەوێ وەڵامـی بداتـەوە، ئـەوجاش بـەو پیـاوە دەڵێـتو دەنووسێت كە من تۆم خۆش گەرەكەو هەرچی بوونمو نەبوونم هەیـە، هـەموو رازو نهێنییـەكانی ژیانم، دەخەمە بەر پێی تۆ چونكە خۆشم دەوێی."

من لە وشەیەك دەگەڕامو بۆم نەدەدۆزرایەوە.

– من ئەم فیداكاریو لەخۆبوردەییە لە تۆدا نابینم. مارگرێتا پێكەنی، جا دەیویست گاڵتـە بـە من بكـات یـا دەیویسـت وەكـو هەمیشـە شـادی ببەخشـێتەوەو لەهـەر شـوێنێك دا بـێ خۆشـی بـڵاوە بكاتەوەو خەمباری من بتارێنێ یان بەوە پێدەكەنی كە شتێكی لە من شاردۆتەوەو پێی نەگووتم.

– نـەء تـۆ سـەهویت، مـن خوێندوومەتـەوە. تـۆ نـاتوانی ئـەو تاتیانایـەش بـی كـە ئێسـتا مێـردی بەجەنـەراڵ كـردووە، ژنـی جەنەراڵێكـە كـە خۆشـی ناوێـتو ئـەوجاش ئامادەنیـە كـاتێ كـە كۆنـە دڵدارەكەی دێ بۆلای، ئەودڵدارەی كە رۆژێ لە رۆژان سۆزی ئـەوو خـودی ئـەوی لـە پـێ كردبووو ئەمێستا پەشیمان بووەتەوەو خۆشی دەوێ، تاتیانا، ژنـی جەنـەڕاڵ، بـە ڕواڵـەت بەشـكۆو شـاناز، لە جەوهەرو كرۆك دا دڵشكاوو پەریشان، تاتیانا ئامادەنیە دەگەڵ ئەم دڵدارەدا بـژیو دەسـت بـە مێردەكەیەوە بنێ... تۆ توانای ئەم فیداكارییەت نیە.

هەمویس پێكەنی، بەڵام بەدەم پێكەنینەوە قسەیەكی كرد خستیمە بیرو ئەنێشـەوە. ئەوسـا پـەیم بـە بایـەخی قسـەكانی نـەبرد، ئـەو رۆژە وام خـەیاڵ كـرد كـە چـونكە هەنـدێ هەڵچـوو بـووم، بـۆ هێوركردنـەوەی مـن ئـەو قسـەیەی كـردووە. پێـی گـوتم: "چـوزانی، بـەڵكو بمـەوێ فیداكارییـەكی گەورەتر بكەم. خۆ هەموو شتێك نا گوترێ. با ئەم لاپەڕەیە تەواو بكەین..." ئاقیبەت ئەو دەرفەتە ڕەخسا. رۆژێكی هەینی، پاش نیوەڕۆ میوانی مارگرێتاو بابی بووم. مارفینكاش لەوێ بوو.

**هەموو دانی بەیانیەکەی ئەو رۆژە من لە ماڵەوە بووم. دنیا ساردو سەهۆڵبەندان بوو، تەنیا بۆ ماوەی چەند دەققەیەك ئەو رۆرژنامانەم کە دەربارەی جەنگ بوون، خوێند بووەوە، ئیدی هەموو رۆژەکەم بە گوێگرتن لە بەکرەی سەمای مەرگ–Dance macabre کە دەمێ بوو کڕی بووم، رابوارد. لە کتێبانی هونەریدا ئەو وێنەیەم کە هلباین لە مەڕ سەدەکانی ناڤینی وێنا کردبوو، موتالا کرد.**

**نزیکی سەعات دووی پاش نیوەڕۆ لە ماڵ وەدەرکەوتم، بە پێیان بۆ ماڵی مارگرێتا رۆییم. بایەکی تەزی دەهات، هەوا وشك و دنیا سەهۆڵبەندانی تەواو بوو. سەعات سێی پاش نیوەڕۆ بوو. هەر چەند دنیا هەتاو بوو بەڵام بەفری ژێر پێی بنیادەم قرچە قرچ دەشکا. خەڵکی لە سەرمادا بەشەقەماکاندا هەڵدەهاتن. من هێندە سەرقاڵی خۆم بووم کە سەرمام هەر لە بیر نەبوو. من تەنیا لە بیری مارگرێتادا بووم‌و لە دڵی خۆدا بیرم لەوە دەکردەوە کە بۆچی سەمای مەرگ– Dance macabre ئەوەندە کاری تێکردووە. ئەو لەهەر جێیەك بێ، هەمووی کەیف‌و سەفایە، ئارامی‌و شادمانیە، خەندەو پێکەنینە، ئەوو مەرگ کوجامەرحەبا. سەمای مردووان، سەمای مەرگ چ کارێك لەو دەکات، بنیادەم دەبێ چەند لە ژیان بیزار بێ تا لەزەت لە سەمای مەرگ، سەمای ئێسکەپەیکەری مردووان ببینێ‌و بە ئاواتی بخوازێ. نازانم بۆ پەریشان بووم؟ خۆ من بە درێژایی رۆژەکە، چەندین هەفتەو چەندین مانگ بوو بە ئومێدی ئەو رۆژە دەژیام، رۆژێك پاش نیوەڕۆیەك لەگەڵ مارگرێتا دابم‌و رەجەبۆف لەوێ نەبێ. بێگومان بە درۆوە بە رەجەبۆفیان گوتووە کە ئەمڕۆ لە ماڵ نین‌و پولیان پێوەناوە. باشە ئەگەر رەجەبۆف بێت چ دەبێ؟ هۆی ئەم پەریشانیەی من چ بوو؟ لە هیچی نەبوو دڵم کەوتبووە ترپەترپ. کە وەژوورکەوتم هەستم کرد مارگرێتا خەمبارە، پێنەدەکەنی، بەڵام سەدای بە بەرزی‌و میناکی دەنگی سکەی زیو دەنگی دەدایەوە: "باش بوو زووتر هاتی. دۆستەکەم هێشتا نەهاتووە. مارفینکا هەر ئێستا دێت. زۆر تەنیا بووم. بابم نەخۆشە، حاڵی باش نیە، نایەتەلامان. لە بەیانیەوە تا ئێستا بەوەوە خەریك بووم. بەڵام حاڵی باشترە. رەنگە تا سەعاتێکی دی بێت. سەرماتە، فەرموو لای سۆپاکەوە."**

**– ئەگەر بابت نەخۆشە، ئیجازە بفەرموو بامن مەرەخەس بم.**

**– نە بابە، بمێنەوە، من زۆر خۆشحاڵم کە تۆ هاتی.**

**لێکدا لێکدا قسەی دەکرد، قسەی لەگەڵ خۆیدا دەکرد، پرسیاری لەمن دەکرد. بەتەنێ بووین. چ دەرفەتێکی لە بارە پێی بڵێم کە تۆ بۆ من دەکەیە چی، چ پایەیەکت لە ژیانی مندا داگیر کردووە، پێی بڵێم کە ژیانی من تا ئێستا کارێکی ئاسان‌و یەکهاوی، بەڵام پڕ زەحمەت بووە. پێێ بڵێم کە ژیانی من یەکپارچە رەنج و زەحمەت‌و ئازار بووە، لە هەموو ئەمانەش خراتر بێ جوڵەو بێ گۆڕان بووە. پێێ بڵێم کە من تاکو نهو تەنیا بەڵاو مەینەتیەکانی ژیان، برسێتی خەڵکی، ئازاری داماوان، کوشتارو زوڵم‌و زۆرم دەبینی. پێی بێژم کە هەموو رۆژێك لە خەو رابوون، بێ ئامانج‌و مەبەستێك لە ژیاندا، دەست لەسەر دەست دانان، هەموو رۆژێ رۆن‌و برنج مەسرەف کردن بۆ من کوشندەبوو. ئێستا لەوساوە کە تۆم ناسیوە، دنیایەکی دیم لەبەردەم کراوەتەوە. پێی بڵێم کە ژیان ئیدی بریتییە لە مۆزیقاو هونەر. پێی بێژم کە ژیانی من تانهو بەبێ هونەر بووەو ئەگەر**

هونـەرێکیش لـە ئـارادا بـووبێ، بـێ ژیـان بـووەو گیـانی لەبـەر نـەبووە، پێـی بێـژم کـە تـۆ دنیـای ڕاسـتەقینەت بـەمن نیشـان داوە، پێـی بڵـێم کـە ژیانـت وەبـەر ژینـی مـن خسـت، پێـی بڵـێم کـە دۆستایەتی تۆ هیواو ئاواتم پێ دەبەخشێت، ئاه چەندم شت پێ بوو کە دەمویست پێی بڵێم، دەمویست پێی بڵێم کە خوشم دەوێی. زمانم بەسترا بوو، زارم چوو بووە کلیلـەو تـەنیا بـە نیگـای چاوان دەمویست ئەم شتانەی تێ بگەیەنم. مارگرێتا هەمیشە لە نیگا قوڵەکانی من دەترسا، بەڵام خـۆی لـە گێلـی دەدا. بـەڵام ئـەمڕۆ لـە هـەموو ڕۆژێـك خراتربـوو، یەکبینـە قسـەی دەکـرد، بـۆ سـاتێکیش زاری لێـك نـەدەنا. یـا لـە بێـدەنگی دەترسـا یـان دەیویسـت روحـی لـەمن وەشـێرێ، دەیویست گیانی بە پەیڤان داپۆشێت.
مارفینکا هات. بەروسی قسـەیان کـرد. وام لێهـاتبوو کـەمێك حـاڵی دەبووم. چاو شیرینیان هێنـا، پاشان بـە دوو قـۆڵی لـە پشـت پیانۆکـەوە ڕۆنیشـتن. Dance macabre واتـە سـەمای مـردووان، واتە سەمای مەرگ بە خەتێکی درشت لەسەر نۆتەی پیانۆکە نووسرا بوو، ژوورەکە کپ و بێدەنگ بوو، دەنگی خشەخشی نۆتەکان دەهاتە گوێ.
بێدەنگییەکی تەواو بۆ چەند ساتێك بەرپا بوو.
مـن ئانیشـکم بەسـەر سـێ سوچـی مێزەکـەدا دادابـوو، هـۆش و حەواسـم لای ئـەوان بـوو. ئـاوازو ئاهەنگەکانی هەوەڵ ترس و غـەریبیان لا چێکردم. Macabre بوون، هـیچ وشـەیەك لـە فارسـیدا پڕ بە مانای ئەو وشەیە نییە. شـووم بـوون لـە نێـو ئـاوازو ئاهەنگەکانـەوە بـە باشـی روحـی پـەیڤم دەژنەوت.
سەعات، دوانزە زەنگان لێدەدا. لەم سەعاتەوە تاکو سپێدە، مردووەکان ئازادن، ئازادی ئازاد.
نیوە شەوە!
چ شەوێکی سامناك
هەموو شەوێك بەو جۆرە قورسە. چونکە ژیانی ئێمە قورس و گیان پروکێنە. ئەوان چیتر گیانیـان ناپروکێ، مردووەکان گیانیان نیە.
چونکە ئێمە وەکو یەك نین، یەکسان نین، بەڵام مردووەکان وەکو یەکن، یەکسانن.
مردووەکـان لـە نیـوە شـەوەوە تـا بـانگی کەڵـەبابی بـەیانی ئاهـەنگ دەگێـڕن، ئاهـەنگی ئـازادی، ئاهەنگی رزگاری لە مەینەتی و دەردەکانی ژیان.
هەر هەموویان بەرابەرو یەکسانن.
نە شان و نە گەدا، نە پیرو نـە لاو، نـە کیـژو نـە کـوڕ، نـە ژن و نـە پیـاو، هـەموو هـەر مـردوون. هـەر هەموویان ئێسکە پەیکەرن.
نە کەس پۆیلە بەسەرەو نە کەس شڕە لەبەرە، دەستی یەکتر دەگرن و دەرەقسن.
مــەرگ کــە کۆڵکــەی هاوبەشــی هەمووانــە، بەشــێکە لــە هــەموویان، خــودی ئەوانــە، مــەرگ ئێسکەپەیکەرەکانی هێناوەتە سەما.
مەرگ، بـە لولاقێکـەوە کـە ڕۆژێ لـە ڕۆژان لاقـی کیژۆڵەیـەکی باڵابـەرز بـووە، لەسـەر کەللەسـەرێکی دیوار ئەستوور، تەپڵیان بۆ لێدەدا.

کە سەعات دەبێ بە دوازدە، ئێسکەپەیکەرەکان لە گۆڕیچەی گۆڕەکانەوە دێنە دەرێ و دەڕەقسن.
مەرگ کە خودی ئەوانە، چونکە ئیدی هیچ فەرماندارو فەرمان پێکراوێك لە گۆڕێ نیە ئاهەنگێکی نەرم و خۆش لێدەدا.
مردووەکان بە دەوری یەکدا دەس دەقوتن و هەڵدەپەڕن. ئەمەی کە هێشتا نێشخەن بە ئێسکەپەیکەری دەموچاویەوە دەبینرێ، ئەمە لە ژیاندا قازی بووەو بە دەردو ژان و سکاڵای مەحکومان پێکەنیوە، بەڵام تازە مردووە، بەم زووانە ئەم شوێنەوارە لە کەللەیا مەحو دەبێتەوە، ئیدی ئەم شوێنەوارە لە نێوان کاژێرەو گۆناکانیدا نامێنێ. چونکە ئیدی ئەو مردووەو ئازادە.
ئەمەی کە ئێسکەکانی پشتی کووڕە، ئەوە لە ژیاندا پشتی دانەواندووەو سەری شۆڕ کردووە، لێرە ئیدی پێویستی بەمە نیە، چونکە ئەوەی ئەوی لە خەڵکانی دی جیا دەکردەوە، واتە پێداویستییەکانی ژیانی رۆژانە، باوی نەما، لێرە نە خەندە هەیە نە گریان، نە شادی نە غەم، نە دڵ تەنگی و نە هیوا، نە فڕناخی و نە سوکایەتی، نە زوڵم و نە لاڵانەوەو کوڕوزانەوە، نە برسێتی و نە تێری.
هیچ شتێك لێرە نییە، جگە لە مەرگ، جگە لە ئازادی.
ئایا ئەم مەرگەو ئەم ئازادیە لە ژینی بندەستی و کۆیلەیەتی، لە ژینی نێو زندان باشتر نییە.
ئایا ئەم مەرگە لەوە باشتر نیە کە قازی بە عەزابی مەحکومی خۆی پێ بکەنێ و پۆزی بەسەرا لێ بدات؟
ئایا ئەم مەرگە لەوە باشتر نییە کە ئاتاج پشت دابنەوێنێ!
ئایا ئەم مەرگە لەوە باشتر نیە کە بەشەر لە بەندا بێ؟
لەبەر ئەمەیە کە ئەوانە ئاهەنگیان سازداوە.
سەما دەکەن، چونکە ئازادن.
مەرگ بە لولاقی کیژێك لەسەر کاسە سەری کەللە زلێك، ئاوازو سروودی سەمای مردووانیان بۆ لێ دەدا.
حەیفێ، ئەم ئازادییەش سنووردارە.
کەڵەباب بانگی بەیانی دەخوێنێ.
هەموو مردووەکان، گشت ئێسکەپەیکەرەکان بڵاوەی لێدەکەن.
دەنگ... دەنگ
من ئەم دیمەنەم لەو مۆزیقایەدا کە مارگرێتا و مارفینکا لێیان دەدا دەبینی.
کە تەواو بوو، هەردووکیان رەنگیان پەڕی بوو، سەیری منیان دەکرد. من حەپەسا بووم".
مورتەزا هەناسەیەکی درێژو قووڵی هەڵکێشا. ئەم بە شانەی دوایی بە نیمچە بێ ئاگاییەك دەگێڕایەوە. ئیدی گوێی لەوە نەبوو کە کەسێك گوێی لێدەگرێ یان نا، گومان لەوەدا نەبوو کە هێشتا لە ژێر گوشارو کابوسی ئەو رۆژەدا بوو.
"ئیدی هیچم لە یاد نەماوە کە ئەو رۆژە چی رووی دا. دەزانم کە بە درێژایی ئەو شەوە وەکو جەنازە تا سپێدە کەوتم، لەگەڵ ئەمەشدا بەیانییەکەی هێشتا هەر پەرێشان و تووڕە بووم.

ئەوەندەم بیر دێ کە ڕۆژی دوایی هەمیشە دەموچاوی ڕەنگ پەڕیوی مارگرێتا پاش ئەوەی کە (Dance macabre)ی تەواو کرد بوو، لە بەرچاوم بەرجەستە دەبوو.
ئیدی دڵنیا بووم کە مارگرێتا ئەو کیژە زار بە پێکەنین و شادی بەخشە نیە کە من وێنام دەکرد، و لە ژێر ئەم جۆرە پێکەنینەدا رازو نهێنییەك پەنهانە. من پەرێشانی ئەوە بووم کە بۆچی تا نهۆ نەم ناسیوە.
ڕۆژی دوایی نزیکەی سەعات شەشی پاش نیوەڕۆ لە ژوورەکەی خۆم دانیشتبووم و گوێم لە بەکرەی Dance macabre دەگرت کە لە پڕ دیتم ئەو گلیمەی کە لەبەر سەرما بە شووشەی دەرگاکەوەم هەڵواسی بوو، بە دەستێکی چکۆلەی لە دەستکێشی چەرما، جولا، دەستەکە چەند جارێك کێشای بە شووشەکەداو پاشان وەژوور کەوت. مارفینکا لە ناو ژوورەکەی مندا وەستا بوو.
بە سیمایدا دیار بوو کە شتێکی تازە قەوماوە. مارفینکا فارسیەکەی باش نەبوو و منیش ئەوەندە روسی فێر نەبوو بووم کە بتوانم قسەی دەگەڵ بکەم، بەڵام ئەوەندە حاڵی بووم دەیویست بە هەر زمانی بووە، ناچارم بکات، تا زووەو بە پەلە بچمە هانای مارگرێتا، بەڵام چی قەوماوە، چی بووە، من چ کارێکم لە دەست دێ، نەمزانی، بە هەشتاو لە ماڵ وەدەرکەوتم. چونکە لەسەر جادەکە ئوتومبیل و گالیسکەم دەست نەکەوت – دنیا سارد بوو و گالیسکەکان خۆیان دابووە پەنا– و مارفینکاش بە پێڵاوە پاژنە بەرزەکانیەوە نەیدەتوانی بەسەر ئەرزە بەستەڵەکەکەدا غار بدات، پێم گوت: "من دەڕۆم و تۆ بە تەنێ وەرە".
نیوەی ڕێگاکەم پتر بە غاردان بڕی، ئاخری سواری ئوتوبوس بووم، پاشان گالیسکەیەکم پەیدا کرد. لە نێو گالیسکەکەدا بیرم کەوتەوە کە ئەو وشە روسیەی کە مارفینکا لێکدا لێکدا دەیگوت و دەیگوتەوەو من لێی نەدەگەیشتم، فارسیەکەی (خۆکوژی) بوو. مارگرێتا دەیەوێ خۆ کوژی بکات، من دەتوانم ڕێی لێ بگرم، چاوانم ڕێشکەوپێشکەی دەکرد، خۆم گرت. زۆرم لە گالیسکەچییەکە کرد کە خێراتر بڕوات. دەیگوت: "ئەسپەکانم لەسەر ئەم سەهۆڵە دەخزێن، ناتوانم لەوە خێراتر بڕۆم".
– یەك تۆز خێراتر، کارێك بکە کە تۆزێ زووتر بگەم.
لەسەری شەقامی نادری لە گالیسکەکە دابەزیم، نەم دەویست خەڵکی پێم بزانن. نزیکەی سەعات حەوت گەییمە بەر دەرکەی ئەوان. دنیا تاریك بوو. دەرگا لەسەر پشت بوو، خۆم بەحەوشەدا کرد.
کە لە قاڵدرمەکان هاتمە خوارێ، ترسام. وام زانی شێت بووم. ڕەجەبۆف لە ناوەندی حەوشەدا یەك تەختە کەوتبوو. خوێن لەسەری دەهات، وێڕای تاریکی دنیا خوێنەکەم بینی.
مارگرێتا بە چاوانی گێژو وێژەوە، بە دەموچاوی درێژ کۆلەوە، دەستی نا بووە پشتیو هاواری دەکرد، بابی مارگرێتا بە جلکی خەوەوە دەستی بە محەرەو تامانی قاڵدرمەکەوە گرتبووو دەیویست بێتە خوارەوە
مارگرێتا زمانی چوو بووە کلیکە: "من... من."

لە باوەشم کرد، بردمە ژوورەوە، وەکو بی ناو ئاو دەلەرزی. لێم پرسی: "تۆ ئەمەت کرد؟ تۆ کوشتت؟

– من... من...

بابی مارگرێتام راکێشایە ژوورەوە.

هیچ نیە. خەمت نەبیٚ. خۆت مەپەشۆکێنە. هەر ئێستا بۆ خەستەخانەی دەبەم.

ئەو جارووم کردە مارگرێتا.

– مارگرێتا، ئەمە بە کەس نەڵێی، بەڵێنم بدەیە کە ئەم قسەیە دووبارە نەکەیەوە. ئەگەر یە ك تۆز منت خۆش دەویٚ، قەولم بدەیە کە ئەمە بە کەس نەڵێی. ئەگەر باوکت نەیزانیوە، مەیەڵە بزانیٚ، برۆ ئیسراحەت بکە.

مارگرێتام لە باوەش گرت، دەستو دەموچاویم ماچ کرد، لێم دووبارە کردەوە: "مارگرێتا من بۆ خەستەخانەی دەبەم، هیچ نیە چاك دەبێتەوە." لە ماڵ دەرپەڕیمە دەریٚ. بە دوای گالیسکەدا دەگەڕام، بینیم مارفینکا وا خەریکە دێت.

– تۆش بڕۆ. حاڵی باش نیە. چووە بنویٚ.

گالیسکەم دەست نەکەوت. گەڕامەوە حەوشەو هاوارم کرد.

– مارگرێتا، مارگرێتا بە هیچ کەسێك نەڵێی. بە هیچ کەسێك. جەستەی نیوەگیانی رەجەبۆفم دا بەکۆڵماو لە ماڵ بردمە دەریٚ. دەمویست چ بکەم، نازانم.

کاتێکم بە خۆزانی سەیرم کرد خەڵکی دەوریان داوم‌و پاسەوانێك بۆ جێیەکی بردم. هەر چیەکیان لێدەپرسیم، دەمگوت: "من کردوومە، من کوشتم."

وئێستاش هەر دەڵێم: "من کردم."

چەند خۆشە گوناهی کەسێکی دی لە ئەستۆ بگری‌و چەند خۆشە لە ژیانا ئامانج‌و مەبەستێکت هەبیٚ."

مورتەزا ف، ئیدی قسەی نەدەکرد، لە دنیای خەوا بوو، لە تۆ وایە هەموو ئەمانەی لە خەوا دەبینی. ئیدی تێگەیشتم بۆچی بەم شەوق‌و زەوقەوە بەرەو پیری مەرگ دەڕوات، مەبەست‌و ئامانجێکی بۆ ژیانی پوچی خۆی دۆزی بووەوە.

"٣"

دوێنیٚ بەیانی مورتەزایان لە نێو ئێمەدا برد، وەکو چۆن مەرێك لە نێو مێگەلێکا بۆ قەساوخانە دەبەن. رەنگە من تەنیا کەس بووبم کە پێم خۆش بوو، چونکە لە دڵی خۆدا دەمگوت، بۆ خۆی ئیسراحەتی کردو ئەمشەو سەعات دوانزە بەشداری سەمای مردووان دەکات، دەستی رەجەبۆف دەگرێت‌و پێکڤە ئاهەنگی ئازادی دەگێڕن، بیٚ بوغزوکینە، بیٚ تەماعکاری‌و چاوچنۆکی، بەڵام ئازادی ئازاد. نا، وانیە.

ئەمڕۆ بەیانی هاتن‌و شمەك‌و سیپاڵەکەیان کۆکردەوە. ئیدی دڵنیا بووین کە ئیعدامیان کردووە . کاتیٚ کە دەمویست شمەکەکانی کۆبکەمەوە چەند پەڕە کاغەزێکم دۆزییەوە. من بە دزییەوە

خوێندمەوە تا بزانم ئەگەر پێویست بکات بیاندەمێ و وەکو بەشێك لە شمەکەکانی بیبەن و بیگەیەننەوە ماڵەکەی، یان ئەگەر بە قاچاخ دەستی کەوتووە، بە هەر جۆرێ بووە بیگەیەنمەوە بە مارگرێتا یان خوشکەکەی.

بەڵام ئەم نامەیە دەست خەتی مورتەزا نەبوو، دیار بوو کە لە دەرەوە هاتووە. ئەمە دەقی نامەکەیە: "دڵدارەکەم، ئەی تاقە دۆستی من، بەلای تۆوە من هەموو کاتێ هەر کیژێکی سەرسەری و سەرڤەسەرڤە بووم، پێدەکەنیم، قسەم دەکرد، کەمتر منت بە غەمگینی دیتوە، وانیە؟ جارێکیان لە بەینی قساندا پێت گوتم کە فیداکاری لە من ناوەشێتەوە، فیداکاریم لە دەست نایەت. هەندێ جار رەنگی بزرکاوم لە رازە پەنهانەکانی دڵمی ئاگادار دەکردیتەوە، سەرنجی رادەکێشایت بەڵام قاقاو پێکەنینی من هەر زوو ئەم بیرانەی لە مێشکت دەتاراند، وا نییە؟ لەوەشە هەندێ جار لە دڵی خۆتا گوتبێتت کە من گاڵتەت پێدەکەم و تۆو هەستەکانی تۆم بە هەند نەگرتووە، وا نییە؟ تۆ سەهوو بوویت دەزانی؟ پەی بردن بە دەردی خەڵکی کارێکی ئاسان نییە، چ جای ئەو بەڵاو مەینەتیانەی کە بە سەر من هاتوون و تەحەمولم کردوون، ئێستاش بە جورئەتەوە ئامادەی تەحەمولم. ژیانی من سەراپا فیداکاری و لە خۆ بردوویی بوو. دڵدارەکەم، ئازیزەکەی من، دایکم لە دوا نامەیدا نووسی بووی، کە ئاگاداری باوکم بکەم. دایك و باوکم زۆریان یەکتر خۆش ویستبوو، هێشتاش هەر یەکیان خۆش دەوێ، چەرخی زەمانە ناچاری کردن لێکدی جیاببنەوە. زۆر جار دەمبینی کە بابم بە سەعاتان لە بەردەم وێنەکەی دایکم دا دادەنیشت و لە فکران ڕادەچوو. دایکم لەوەتای من فامم کردووەتەوە هەمیشە ئامۆژگاریم دەکات، رام دەسپێرێت کە ئاگام لە بابم بێ و هەوڵی ئەوە بدەم کە پێی رابگەمو بابم منی فرەخۆش دەویست و لەبەر خاتری من هەموو مەینەتیەکی ژیانی تەحەمول دەکرد. ئەوەندەی هەموو دنیا لە رەجەبۆف بێزار بوو، بەڵام چونکە منی خۆشدەویست هەموو مەینەتیەکی ژیانی، سەرباری هاتوچۆی رەجەبۆف بۆ ماڵی ئێمە، بە روویەکی خۆشەوە قەبوڵ دەکرد. رەجەبۆف بۆ قازانج و بەرژەوەندی خۆی بابمی لە کۆمەڵێك مامەڵەی ترسناکدا شەریك کردبوو، و بەمجۆرە ژیانی ئێمەی وێران کرد، لە سەرەتادا رەجەبۆف بۆ قازانجی خۆی یارمەتی بابمی لە کارەکانیا دەدا، بابم رەجەبۆڤ لە روسیاوە دەناسی و ئەو لەوێندەر دەڵاڵی دەکرد. بەڵام لەم دواییانەدا چونکە چاوی تەماعی بڕی بووە من، ئیدی ژیانی ئێمە بەبێ کۆمەکی ئەو مەحاڵ بوو. ئەگەر چی رەجەبۆف قازانجی خۆی دەکرد، مەگەر خوا بزانێ بابم چ رۆژگارێکی سەخت و دژواری رادەبوارد، لەلایەکەوە هەر لەبەر خاتری ئەوەی کە ژیان لە من تاڵ نەبێ، رەجەبۆڤ تەحەمول دەکرد، لەلایەکی دیکەشەوە نەیدەتوانی من بەو بسپێرێت. لەم کەین و بەینەدا تۆ پەیدا بوویت. ئەڤینی من، ئەی کاشکێ نەهاتبای. لە ژیانی مندا تروسکەی ئومێدێك هەڵهات، ئەم ڤیانە پەنهانە، ئەم ڤیانەی هیچ کەسێك تەنانەت مارفینکاش ئاگای لێ نەبوو، ئەم ڤیانەی کە لە هەر ئاگرە گڕەیەك بە سوێ ترە، ئەم ڤیانە هێڤی و ئاواتی پێ دەبەخشیم، من ئامادە بووم کە میناکی تاتیانا هەموو ژیانی خۆم بکەم بە قوربانی تۆ، هەڵیرێژمە بەردەم تۆ، لە بەردەم تۆدا دای بنەم، بەڵام دڵنیا بووم کە تۆ ئەوەت نەدەکرد، وا نیە؟ ئەنجام لە رای ئاسوودەیی بابمدا چارەیەکم

دۆزییەوە. رۆژێ پێم گوت کە من بە تەواوی رەزامەندی ئامادەم شوو بە رەجەبۆف بکەم، بەڵام بابم وێڕای سوور بوونی رەجەبۆف هەمیشە ئەم کارەی دوا دەخست، چونکە دڵنیا نەبوو. ئەو رۆژی هەینییە، ئێمە بە رەجەبۆفمان گوت کە لە ماڵەوە نابین و لە ماڵی دۆستێکی بابم دەعوەتین، بەڵام کاتێ کە تۆ لە ماڵی ئێمە دەرچوو بوویت، تۆی دیتبوو، هەر هەمان شەو، هەر چەندە بابم نەخۆش بوو، سەبارەت بە من قسەی لەگەڵ کردو سوور بوو لەسەر ئەوەی کە لەزەرفی چەند هەفتەیەکدا دەزگیرانداری من بۆ هەمووان ئاشکرا بکرێ و ئاهەنگێك بگێڕدرێ. هەر ئەو شەوە بابم سەکتەی گرت و من دڵنیا بووم کە ئیدی لەم نەخۆشییە هەڵناسێتەوە یان ماوەیەك زەمینگیر دەبێت.

من لە بیری ئەوەدا بووم کە لەم عەزابەی رزگار بکەم و خۆم و بابم بکوژم، هەموو کەرەسەیەکی ئەم کارەم بۆ هەمان رۆژی شەممە فەراهەم کردبوو، دەمویست بەکرەی – Dance macabre دابنەم و بە دوو قۆڵی بمرین. من مژولی زەمینەسازی ئەم کارە بووم کە رەجەبۆف هات بەسەرا، ئیدی لەم کات و ساتەدا سیمای ئەوم پێ تەحومول نەکرا، داوام لێکرد و پاشان ئەمرم پێکرد کە لە ماڵی ئێمە وەدەربکەوێ، هەندێ قسەی قۆڕو نا شیرینی سەبارەت بە پەیوەندی نێوان من و تۆ کرد. سوکایەتی پێکردم، تانەی لێدام، ئەوجا کەوتە شەڕفرۆشی، تەنانەت بە نیاز بوو بێ حورمەتیم پێ بکات. مەست بوو. من بە دارعاسا ئەستوورەکەی بابم هەڕەشەم لێکردو ئەوسا لە ژوورەکە وەدەرم نا، کاتێ گەییە بەر هەیوانەکە لەسەر قاڵدرمەکانەوە بۆ خوارەوە دەڵەکم دا، پێی خزی و سەری بە گۆشەی پلەکەدا کەوت. ئەڤینی من، باقیەکەی دەزانیت، کارێکی خراپم کرد. هەق وابوو تۆم ئاگادار بکردایەتەوە، وا نییە؟ باوکم مرد، بەڵام وا دەزانم کە قۆناغی فیداکاری من هێشتا تەواو نەبووە، هێشتا نەوێرام هەواڵی مردنی بابم بۆ دایکم بنووسم. تۆ ئەم کارە بکە. هەرچییەك دەربارەی من دەزانی بۆ دایکمی بنووسە، بۆی بنووسە کە کیژی شایستەو لە باری ئەوەو منیش دەزانم فیداکاری بکەم. مەبەستم لە ناردنی ئەم نامەیە ئەمەیە کە من ناتوانم تەحەمولی ئەوە بکەم تۆ لە زیندان دا بیت و یان بمریت و من چ مەبەست و ئارمانجێکم لە ژیاندا نەبێت. رەنگە ئەگەر قازیان بە وەزعو حاڵی من بزانن حوکمی ئیعدامم نە دەن. من دوای دە ساڵ یان یازدە ساڵی دی لە زیندان دێمە دەرێ. ئەوسا ژنێکی بەختەوەر دەبم، تۆم خۆش دەوێ و بە خۆشی و خۆشەویستی تۆوە دەژیم، ئەگەر مردیشم بە خۆشییەوە دەمرم. بڕیارم داوە، هەر ئەمڕۆکە خۆم بدەمە دەست پۆلیسەوە. مارگرێتا".

دوای چەند رۆژێك هەمان ئەو کەسەی بە دەنگی بەرز هەموو کەسێك بانگ دەکات و مورتەزای کوڕی جەوادی گاز کردو بەرێی کرد، ناوی منی گاز کردو بڕێك خۆراك و کڵاوەکەشی بۆ هێنامەوە. لەو دەفتەرەدا کە من رەسینی شتەکانم ئیمزا کرد، نووسرا بوو: "هێنانی: ... مورتەزا ف."

دوای چەند رۆژێکی دیکە دیسان پارەیان بۆ زیندانیەکان هێنا، کاتێ کە یەکێك لە هاوژوورەکانی من وەسڵی پارەکانی ژێرو ژوور دەکرد تا وەسڵەکەی خۆی بدۆزێتەوە، وەسڵێکی هاتە بەردەست کە هی زندانی ژنان بوو، و لەسەری نووسرا بوو: "ناوی وەرگری پارە: مارگرێتا".

٢٠/٢/٨ (١٩٤١)

<u>تێبینی:</u>

*لە ٢٠٠٩/٦/٢٦ لە شاری سلێمانی، گەڕەکی رزگاری لە وەرگێڕانی ئەم کتێبە بوومەوە. کە لەم سەرچاوەیەوە پاچڤە کراوە:*

**چمدان، بزرگ علوی**

**چاپ چهارم ١٣٨٧**

مؤسسة **انتشارات نگاه.**

# فەرهەنگۆك

## ئا

ئەداو ئەتوار: ڕەوشت و ئاكار

ئارایشتكار : ئارایشتگەڕ، مكیاجكار

ئەوك : قوڕگ، ەروو، بەرمل

ئاسیو : ئازار، بەلاْ ، زیان، زەرەر

ئاشخانە : مووبەق، چێشتخانە

ئەنگۆ: ئێوە، هەە، هون

ئەگەرنا : دەنا ، ئەگینا ، ئەگین، گەرنا

ئێژی : دەڵێی

ئەفسووناوی : سیحراوی، جادوویی

ئیكلام : كڕنۆش، سەرچەماندن بۆ ڕێزگرتن

ئامێز : باوەش، هەمێز

ئەزبەنی : گەورەم، قوبان

ئاران: گەرمەسێر، گەرمیان، زستانەوار

ئۆین: پیلان، دەسیسە، فێڵ و مەكر

ئۆینباز : بەمەكرو فێڵباز، پیلانگێڕ

ئێشك: پاس، كێشك

ئاكنجی: نیشتەجێ

ئالوودە:گیرۆدە، خووپێگرتوو

ئاوەز: هۆش، فام، ئەقڵ

ئاشپەز: شیوكەر، چێشت لێنەر، چێشت چی

ئەنگێزە: هۆ، هاندەر، سۆنگە

ئەستەم: زەحمەت، ئاسێ ، دژوار

ئیرەیی: حەسوودی

ئەستێڵ: حەوز

ئیستەرەم: دەمەوێ

ئەستڕ: بەر، بەری كەواو...

ئاپۆڕا: حەشامات، قەرەباڵغی

## ب:

باوەژن: زڕدایک، هۆی دایک، باجی

باب: باوک

باڵانما: باڵانوێن، ئاوێنەی باڵاڕوان

بەلەز: خێرا، بەپەلە، گورج

بلوور: شووشە

بێنەوا: هەژار، بێچارە، داماو

بە تۆبزی: بە زۆر، بە خورتی

بە روحم : بە بەزەیی ، دلۆڤان

برنجە: جۆرە کانزایەکە، زەردی سەماوەر(قصدیر)

بەلەنگاز: بێچارە،نەدار، بەسەزمان

بەرۆك: یاخە، یەخە

بەکاوەخۆ: بە هێواشی

بەرسڤ: وەڵام

بەڕك: گیرفان، باخەڵ

بالیفۆکە: سەرینی بچووك، گۆشە

بوری: تێپەڕی

بیلبتون: بە تەواوەتی

بەو ئاوایە: بەو جۆرە، بەو شێوەیە

باریە: لۆسە

بەستێن: رۆخ، کەنار، گوێ چەم، دەم چەم

بێشە: دارستان، لێر

بەرکۆشە: بەرهەڵبێنە

بن پیاڵە: ژێر پیاڵە

بۆرەقنە: ئامال بۆر، مەیلەو بۆر، بۆرباو

بوێر : ئازا، دلێر

بێوەی: بێ زیان، سەلامەت

باڕ : بێچووە مەلی بەهارە

بێزوو: بێزگ، مەگیرانی

بێزگەوان: بێزووکەر

بەلانس: هاوسەنگی

بارتەقا: باتەقا، هەنبەر، بەرانبەر

باجەوان: باجگر

بەسویێ: بە ژان، بە ئازار

بەردەبار: پیاوی زاناو بە تەگبیر

بێدادی: نەهەقی

بەیتاڵ: پزیشکی ئاژەڵان

بویەر: رووداو

باژێرۆك: شارۆچکە

باشار: دەربردن، خۆراگرتن

بەرایی: پێشایی، بەراهی

بەڵەد: شارەزا، ڕێزان، ڕێنوێن

بەفرە ژیلکە: بەفری زۆر دەنك ورد

بەلەك: پووز

## پ:

پێشخزمەت: نۆکەری بەردەستان

پارك: باخ

پواز: سنگێکە لە درزی داری قەڵشاوی دەنێن تا نەیەتەوە یەك

پۆڕ: باڵندەیەکی خۆش گۆشتە، لە مریشك گەورەترە

پێشکار: خزمەتکار

پەیڤ : وشە، وتە ، قسە

پەز: مەڕ، مێگەلە مەڕ و بزن

پەری : فریشتە

پاژ: بەش

پرتەو: تیشك ، روناکی

پێکڤە: پێکەوە، بە هەڤڕا

پڕ: زۆر، تەژی

پۆستین: فەروە، کەوڵی تیسکن

پەژمردە: چەرمسی، ژاکاو

پایدۆس: دەست لە کار هەڵگرتن

پۆڵکە: گاگۆز

پەسیو: پەسیڤ، هەڵامەت

پیتاك: باربوو، کۆکردنەوەی دارایی

## ت:

تەمەشاڤان: بینەر، سەیرکەر

تەژی: پڕ، لیپاو لیپ، سەر ڕێژ

تێشت: نانی بەیانی، قاوەڵتی، بەرقلیان، تاشتی

تالووکە: مەترسی، خەتەر

تەبارە: دەغڵی گەیشتووی نەدوراو، قایمە دەغڵ

تەژەو ناقۆلاَ: گەورەو ناشیرین

تاین: یارۆ، فلاَن، ناڤبری

تاژی: سەگی ڕاو، تانجی

تەشقەڵە: گەڕ، بیانووپێگرتن

تەیرو تو: باڵندەو مەلان

تەوازۆ: تەوازی، عوزرخوایی، داوای بوردن

تخوب: سنوور، کەوشەن، تخووم

تەوێڵ: ناوچەوان، هەنیە، ئەنی، تویێڵ،جەمین

تۆرینۆك:تووڕەو دڵناسك

تەختەبەن: تەختە خەو

تەقوو: بەڵکوو ،هاتوو

تاقەتکردن: شاردنەوە، داکردن

تۆلاز: مێباز، چاو لەوەڕێن

تیلمە: تیلماسك

تیلاگ: لاسەر

تاوەگاز: تاوانگاز، بە هەتاو سووتاو

تەڵفیزی: تەڵفیسی، تەوس، گاڵتەو گەپ

تەریدە : ڕێگر ، چەتە

## ج:

جەگەن: گیایەکە لاسکی سێ سووچە لە زەڵکاودا دەڕوێ

جنگن: شەڕانی، دڕ، نەگونجاو

جەلۆ: هەرزە پیاو، سەرسەری

جندەخانە: سۆزانی خانە، قەحپەخانە

جەڕباندن:تاقی کردنەوە، تەجرەبە کردن

جوڕنە: حەوزۆکەی گەرماو

جما: جولاَ، بزوا

## چ:

چەلەنگ: چوست و چالاك، گورج و گۆلَ، شۆخ و شەنگ

چینی: جۆریَ سوالَەتی هەرەباشە، وەکو کاشی

چتۆ: چۆن، چلۆن، کوو

چڕین: وتن ( بۆ گۆرانی و قام)

چێلَ: مانگا

چەنگ: ئامێرێکی موسیقایە، هارپ

چەکمە: جەزمە، پووت

چەمەنزار: مێرگ، مێرغوزار، سەوزەزار

چما: بۆچی، ئەڕا، لەبەرچی

چقلَ: دڕك، دڕو، دڕی

چەرچی: فرۆشیاری گەڕیدە، دەستفرۆش

چوغورد: چوغور، چغر، چڕ

چمك: سووچ، گۆشە

چوارنکال: هەرچوارلا

چێبوو: دروست بوو

چەمووش: سلَ، رەوەك، لەقەهاوێژو گازگر

## ح:

حایرمان: سەرسام بوون

حەسار: حەوش

حەنەك: جەفەنگ،قسەی گالَتەو گەپ

حەشەری: بەر بەتاو، ژنی بە ئالَۆش

حەژمەت: مەینەت، خەفەت، کەسەر، داخ، خەم

حەجامات: خوێن بەردان

## خ:

خەنی لە خۆتان: خۆشی لە خۆتان

خشکۆك: دەلال، جوانکیلە، جوان، قەشەنگ

خورجین: هەگبەی لە بەن، جانتای لە بەن، خورج

خا: خات، خاتوون، خانم ، یا

خاپاندن: فریودان، تەفرەدان، خەلَەتاندن

خاپینۆك: فریبۆك، فێڵباز

خانەدان: نەجیمزادە، ئەسڵزادە

خودان: خێو، خاوەن، ساحێب

خولك: خولق

خۆرتی: بە تۆبزی، بە زۆری

خشت: رێك، بێ كەم و زیاد

خوبزە: نۆكەر، خزمەتچی، خولاّم

خاكی: بێ هەوا، بێ فیز

خەرگە: پەڕۆی كۆن و پیس

خوابەختەكی: خۆو بەخت، بە هەڵكەوت

## د:

داماو: بێنەوا، بەلەنگاز، بێچارە

دەڤەر: ناوچە، ئاقار، شوێن، جێ

دێركەوتن: دواكەوتن

دلپاقژ: دڵپاك، بێ فڕو فێڵ، بێ گزی

دەربار: دیوەخان و بارەگای پاشا

ژنەوتن: بیستن

داگەڕان: هاتنە خوارەوە

دڵنەواز : دڵگیر، مایەی دڵخۆشی

دلۆڤان: بە بەزەیی، دڵنەرم، میرەبان

هاژۆتن: لێخوڕین

دیدەوانی: ئێشكگرتن ( بە تایبەتی ئێشكی سەر قەلاّت و بورجان)

داپیرە: دایە گەورە، نەنك

دەلیڤە: دەرفەت ، هەل

درەخت: دار

دەرباریيان: دەست وپێوەندانی دیوەخان و بارەگای پاشایەتی

دڕوو: دڕك، چقڵ، دڕی

دڵڕەش: بێ ەزەیی، ستەمكار، دڵرەق، ڕكوونی

دامە: مۆر

دنگ: دینگ، ئامرازی چەڵتووك كوتان

دەڵەكدان: پاڵنان

دڕدۆنگ: دوودڵ، بە گومان

**دوونیەتی: خوێڕیەتی، بچووکی**

**دەڵەچە: مەرایی کەر، ماستاوچی**

**دۆنکی: داردەستی حەسحەسی ناو بازاڕ**

## ڕ:

**ڕەقسین: سەما، هەڵپەڕین**

**ڕنەك: قەشەو**

**ڕدێن: ریش**

**رونداك: فرمێسك، رونتك، ئەسر، ئەسرین**

**رۆحانی: پیاوی ئاینی**

**راز: نهێنی**

**رابوون: هەستان**

**رۆخانە: روبار، چۆم، چێم، ڕوو**

**ڕند: جوان، خوشیك، خوشكۆك**

**رمووده: ئالووده، هۆگر**

**رادەست: خۆ بە دەستەوەدان**

**ڕەند: مێرخاس، مەرد، پیاوانە**

**ڕەقیب: نەیار، خەنیم**

**ریسك: مغامەرە**

**ریوەڵە: بچکۆلەی لاواز، بێ نموود**

**ڕۆنیشت: دانیشت**

**رووپامایی: مەرایی، دەڵەچەیی، بن ریشەیی**

**راموسان: ماچ**

**ڕەهەنە: ڕەهەندە، عەودالْ ئاوارە، چۆڵگەڕ**

## ز:

**زڕکیژ: کچی مێرد بۆ باوەژن، یان کچی ژن بۆ باوەپیاڕە**

**زێدە: زیادە**

**زەلام: گەورە، ناقۆڵاو تەژە**

**زار: دەم، دەو**

**زوڕییەت: وەچەو نەوەو نەتیرە**

**زێد: زاگە**

زاگە: زێد، شوێنی لە دایکبوون، مەفتەن

زوخاڵ: ڕەژوو، خەڵووز

زگڕەش: ڕکوونی، بوغزن، کینە لە دڵ

## ژ:

ژێوان: پەشیمان

ژارخەن: پێکەنینی ژەهراوی

## س:

سەرزەنشت: سەرکۆنە، لۆمە

سەندەڵ: قاپقاپ، تەقتەقیلە

سپڵە: پێنەزان، بێ ئەمەك، بێ وەفا، نمەك حەرام

سۆز: پەیمان، بەڵێن

ستران: گۆرانی، قام، لاوك

سپێدە: بەرەبەیان

سەوزەزار: مێرگ، مێرگوزار، چەمەنزار

سەمت: لا، ئالی، ڕەخ

سەربوردە: بەسەرهات، سەرگوزەشتە، سەربهورد

سەرگوروشتە: سەربوردە،

سخێف: جنێو

سەختگیر:توند و بەزەبت و ڕەبت

سیوات: خوێنەواری

سائەقڵ: شێتۆکە

سەربۆز: سەر ماش و برنج

ساناو: قوڕاو

سێوی: هەتیوو، منداڵی بێ داك و باب

سیکتر: دەرکردن، تڕۆکردن

سونگی: قەمە

سەهەندە: بزۆز، نەسرەوت، زرینگ، ئاژاوەچی

سێبەندی: بێ شەرم و حەیا،

ستێران: ئەستێران

سابرێن: نێری، تەگە

سەرۆ: ئیلهام، سرووش

## ش:

شڕنده: ژنی دەمدرێژی شەڕانی بێحەیا

شڕپۆش: شڕۆڵە، بیَ بەرگ و بار

شەیپور: بۆقی، کەڕەنا

شام: شیو، شیڤ، خواردنی ئێواران

شکەفت: ئەشکەوت

شکەستەنی: ناسك، شتیَ زوو بشکیَ

شتاقیان، هیچیان، کەسیان

شنگ: هێز، تاقەت، توانا

شەقاو: هەنگاو

شلینگ: پارەیەکە

شاپ: شەق

شەکەت: ماندوو، هیلاك

شوورە: دیوار

شەڕبار: پڕشەڕ، شەڕانی

شەنگولێ: بە دەماخ، کەیف خۆش

شەبەیخوون: پەلامارو هێرشی شەوانە

شەلاق: شەلاخ، قامچی

شەم: مۆم، شەمالك

شەمدان: مۆمدان، شەمان، جێگەی مۆم

شۆڤار:زمان شڕ، نێوان تێکدەر، جاسووس

شەکەت: ماندوو. هیلاك

شاشك: مێزەر، پێچی مێزەر

شیرەت: راوێژ، ئامۆژگاری

## ع:

عاسا: دار عاسا، داردەست

عەیار: زیتەڵ، زۆرزان

عەبەنووس: دارێکی رەش و رەق و بەنرخە

عەیان: دیار، ئاشکرا، لەبەرچاو

## غ:

غاڕ: ئەشکەوت

غوڕابی خەو: شیرنە خەو، خەوی قورس

غەوارە: غەریبە، بێگانە

ف:

فەرمایشت: فەرموودە، قسە

فەرخە: بێچوە مەل و جانەوەران

فشقیات: حەنەك، گاڵتەوگەپ، ئاخافتنی بێ تام

فراڤین: نیوەڕۆژە، خواردنی نێوەڕۆ

فەرسەخ: فەرسەق

فڕناخ: لووت بەرز، بە دەعیە، روحزل

فاما: فامیدە، تێگەییشتوو، زیرەك

ڤالا: بەتاڵ، خاڵی، پووك، ئاواڵە، کراوە

## ق:

قالیچە: مافووری بچووك

قرمز: سوور

قەڕاڵ: پاشا

قەڕاڵنشین: پاشانشین، ئیمپراتۆریەت

قورباقە: بۆق

قاوەڵتی: تاشتی، بەرقلیان، نانی بەیانی، تێشت، قاوەتوون

قووچانی: هەڵهات

قشتیلە: بچووکی جوانکیلە

قالۆر: قاوغ

قاپ: قاچ

قاوغ: قەپێلك، قاپۆرە

قوشقی: تووڕە، وەڕەز، سڵ ، ڕەوەك

قەرقەشە: تەشقەڵە، شەرو ناخۆشی

قۆپی: زەڵکاوی قامیشەلاّن

قەڵەمرەو: سنوور و کەوشەنی ژێر دەسەلاّتی کەسێك یان دەوڵەتێك

قوو: باڵندەیەکە لە قاز سپی ترو زلترە

قەلاّیی:کانزایەکی سپی نەرمە مسی پێ سپی دەکەنەوە

قڕاوڵە: تاق تاقکەرە

قاوش: هۆڵ، شوێنی نووستنی بە کۆمەڵ

قەساس: سزا، تۆڵە

قەرەبەخت: بەخت رەش، بەدبەخت، نەگبەت

قامك: پەنجە، ئەنگوست، پل، کلك

قامبێژ: گۆرانی بێژ

قەساو: قەساب

قەلەزراو: ترسنۆك

## ك:

کوت ومت: ەقاودەق

کوانگە: کوانوو، ئاگردان

کارمامز: بەچکە ئاسك

کودەڵە: بێچووە بەراز

کوختە: کۆخ، خانووی چکۆڵەو خراپ

کوڵکە: موو، توك

کولۆ: کوللە

کەوەیی: شینکی، شینباو، خۆڵەمێشی

کێوە: بۆ کوێ

کەپەك: سۆس

کۆمەك: یارمەتی، هاریکاری

کلۆر: ناوبەتاڵ

کوریژگە: کوڕی بچووك

کەپوو: لووت، دفن

کەونارا: زۆرکۆن، شوێنەوار

کەسك: سەوز

کۆمیدی: پێکەنیناوی

کامکردن: نەوس تکان

کەزی: پرچ، زڵف

کلاًوخود: کلاًوی ئاسنینی شەڕڤان

کەرب: رق و کینە

کان: مەعدەن

کێوستان، کۆسار، کۆجاڕ

کۆڵۆنی: موهاجیرنشین، نشیمەن، موستەعمەرە

کەمدوو: کەم قسە

کۆسار: کۆجاڕ، کێوستان

**کەوی: ماڵی، دەستەمۆ**

**کەڤڕ: بەرد**

**کەندەکار: کەسێك کە لە دار نەخش دەکەنێ**

**کێشکچی: پاسەوان، نیگابان**

**کۆ : سڵ، سڵکردنەوە**

**کەپوو : لووت، دفن**

**کارگە : وەرشە**

**کەرپووچ : خشتی سوورەوەکراو**

## گ:

**گۆساخ: چاوقایم، رووقایم**

**گەدا: پارسەك، سواڵکەر، دەرۆزەکەر**

**گورزە: باقەی گەورە**

**گەرەکمە: دەمەوێ ، دەخوازم**

**گەمە: یاری، وازی، کایە**

**گەنج: زێرو زیو، ماڵی دنیا**

**گەردنبەند: ملوانکە**

**گازکردن: بانگکردن**

**گۆرین: یارۆ، ناڤبری**

**گوند: دێ، ئاوایی**

**گومناو: ناوبزر، نەناسراو**

**گۆزینگ : قولەپێ**

**گەلۆز: ناولینگ**

**گول: گەڕ و گول**

**گاگۆز: پۆڵکە**

**گارد: پاسەوانی تایبەت**

**گۆنگ : ئالۆز**

**گەنگەشە: موناقەشە**

**گووراو : موخلووق**

## ل:

**لە کەیفان: لە خۆشیان**

**لە بیلادەوە: لە ئیجادەوە، لە بنەرەتەوە**

لیرەوار: دارستان، جەنگەڵ، بێشەڵان

لاپرەسەن: فزوڵ، فزوڵی

لەزگ بوو: خەریك بوو، وەخت بوو

لێ: بەڵام

لێبڕا: بڕیاری دا

لۆسە: باریە

لاق: قاچ، لنگ

لەزکرن: خێراکردن، پەلەکردن

لایدە: بێگانە

لەهەنبەر: بەرانبەر

لێ : بەڵام

لەیستۆك : بووکەشووشە، بووکەڵە

لەگەز : مەتەڵ

لەش بەبار: نەخۆش

لەگین:رەنگە، لەوەیە

لوتاوە : پیس بووە

لەز : خێرا ،پەلە

لەبڕ : یەکسەری، بەقۆنتەرات

لاشەڕ : بێوەی، سەلامەت ، دوورە شەڕ

لاکەوە : لاچۆ ، برۆ کەنار

## م:

موغازە: فرۆشگە، دوکان

مێریڤان: دلۆڤان، میهرەبان

مشوور: تەگبیر، بەخەم کردن

مژوول: سەرقاڵ، سەرگەرم

ملۆ وموش: ملۆمۆ، گەران و بۆنکردنی زەمین بۆ پەیداکردنی خواردن

مۆڵ: زۆر، فرە، زەحف

مژمژە: مەساسە

میرغەزەب: جەلاد

مەزرا: کێڵگە

مقاش: ماشە

مەگیرانی: بێزوو

**مەرزو بۆ: ولآت، نیشتمان**

**مقەوا: کارتۆن**

**مەنهۆڵ: زێراب**

**مەزڵ: قۆناغ، جێی مەبەست**

**میرەبان : دلۆڤان ، میهرەبان**

**ماڵبات: خانەوادە ، بنەماڵە**

**مدارا :سەبرو حەوسەڵە ، دڵڕاگرتنی دۆست و ئەحباب**

**مووبەق : ئاشخانە**

**منجڕ :نەژنەو ،سوور لەسەر شتێك**

**مسکێن : رەعییەت، بەرحوکمی ئاغا**

**مەعلان : پسپۆڕ ، لێزان**

**مراك : کەوچك ، کەچك**

# ن:

**هێورین: حەوانەوە**

**نەزاکەت: ئەدەب، سەلاری**

**نیگابان: پاسەوان**

**نەیجەزار: قامیشەلآن**

**نسیبەت: بەلآ**

**نەترە: وورە**

**ناچیز: هیچ، زۆر کەم**

**نەژاد: رەگەز، رەچەڵەك، ئەسڵ**

**ناحەز: ناشیرین**

**نێچیرڤان : ڕاوچی**

**نشیمەن: بارەگا ، شوێنی دانیشتن**

**نەزاکەت : لوتف و ئەدەب**

**نك : کن ،لا، جەم ، دەف**

**ناڤبری : ناوبراو**

**نەژنەو :نەبیست، منجڕ**

**نمەد : لباد نیوداشت: نە کۆن و نەتازە**

**نها : ئێستا، هەنووکە، نهوو**

# و:

وەمێنیٚ:بمێنێتەوە

وەکرد: کردەوە

وەشێرت: شاردەوە

وێنا: تەسەور

وار: هەوار، شوێن، مەڵبەن

وێدەدەم: دەدەمیٚ

وەقف کردن : تەرخان کردن

وەردەوەدان : لە جاریٚ پتر کێڵاٚن

وەردیان : زیندانەوان

## هـ:

هانکە هانك: هەناسە برکیٚ

هەژگ: لکەداری وشکەوە بوو، چڕوچیلکەی ئاوردوو

هەڕوگیڤ: هەرەشەو گورەشە

هەڵدێر: جێگەی زۆر بەرزو قیت لە شاخ و کێودا

هەزاربەهەزار: شاخی زۆر بەرزو عاسی

هەڵزنان: هەڵگەڕان بۆ سەرەوە

هایم: سەرگەردان، وێڵ

هەنبەر: بەرانبەر

هەترەش: زەندەق، زراو

هەنووکە: ئیستا، نها، نهوو

هۆشن: بەهۆش

هەتەر: مەودای حوکمی چاو

هۆڤی: کێوی، وەحشی

هزرو هزرین : بیرو بیرکردنەوە

هەیڤ : مانگ

هەدا : سەبر ، حەوسەڵە

هەراوزەنا : هەراو هەنگامە

هەڕەمە : تێکەڵ و پێکەڵ، گەنم ودانەوێڵەی تێکەڵکراو

هاپۆ : مام

هەڵەشە :لەسەر، بیٚ ئەقڵ

هەرەت : تاف

هەتوان : مەرهەم ، مەڵحەم

هەڤڕك : ملەكەر، ململانێ، ڕكبەڕكێ

هەڕوو : هەڕە ، بڕۆ

هەنگێ : هەینێ ، ئەوسا

هەشتاو : پەلە ، لەز، خێرا

## ی:

یاڵ: تووكی سەر ملی شێرو یەكسم

یەكهاوی: یەكجۆر، یەكدەست، بێگۆڕان

یارۆ : فلاَن

یاتاخ : پێخەف ، نوێن

٧

**حەمە کەریم عارف**

* کەرکووکییە و لە ساڵی ١٩٥١دا لەدایک بووە.

- لە ساڵی ١٩٧٥ کۆلیژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو کردووە.

- یەکەم بەرهەمی شیعرێکە بەناوی (هەڵبەستێکی هەتیو کەوتوو) کە لە ژمارە (١٧٠) رۆژنامەی هاوکاری لە ١٩٧٣/٦/٨ بڵاوبووەتەوە.

- لە ساڵی ١٩٧٥ەوە بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبی بڵاو دەکاتەوە.

- سەرنووسەر یان بەڕێوەبەری نووسین یان سکرتێری نووسین یان ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤار و بڵاوکراوانە بووە: گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووک، نووسەری کوردستان، کەلتوور،نووسەری کورد، گوڵانی عەرەبی، ئاڵای ئازادی تا ژمارە ٢٢٢، گۆڤاری نەوشەفەق.

* جگە لە ناوی خۆی، بە تایبەتی لە گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووک،نووسەری کوردستان، کەلتوور، رۆژنامەی ئاڵای ئازادی تا ژ: ٢٢٢ بەناوی گۆڤەند، زنار، سیپان، پاکزاد، محەمەدی حاجی، سیروان عەلی، دیدار هەمەوەندی، هێژا، ح. ع ،هامون زێباری، با زەوان عەبدولکەریم بەرهەمی بڵاو کردووەتەوە.

*لە ساڵی ١٩٧٤ – ١٩٧٥دا پێشمەرگەی شۆڕشی کوردستان بووە، لە هەشتاکاندا بۆ ماوەی نۆ ساڵ، بێ وابەستەگی حیزبی پێشمەرگە بووە و وەکو بەشدارییەکی مەیدانی و ویژدانی لە خەباتی رەوای نەتەوەی کوردا شانازی پێوە دەکات و منەت بەسەر کەسدا ناکات، چونکە باوەڕی وایە کە رۆڵەی میللەتی مەزڵوم مەحکومە بە پێشمەرگایەتی.

- لە هەشتاکانەوە تا ٢٠١٠/٨/٢٠راستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆکایەتی لقی کەرکووکی یەکێتیی نووسەرانی کوردی کردووە.

- زۆر بەرهەم و کتێبی چاپ و بڵاو کردووەتەوە، لێ زۆربەی هەرە زۆریان، بە تایبەتی ئەوانەی لە چیادا چاپ بوون بە نوسخەی هێندە کەم بڵاوبوونەتەوە،لە نرخی نەبوو دان و هەر ئەوەندەیە کە لە فەوتان رزگار بوون. هەندێك لە وانە:

١- تیرۆژ، کۆ چیرۆك، چاپی یەکەم ١٩٧٩
٢- کۆچی سوور، رۆمان، چاپی یەکەم،١٩٨٨،چاپی سێیەم ٢٠٠٧
٣- بەیداخ، چیرۆك، چاپی یەکەم ١٩٨٨
٤- داوەتی کۆچەرییان، کۆ چیرۆك ،چاپی دووەم ٢٠٠٥

٥- له خۆ بێگانه بوون، کۆمه‌ڵه چیرۆك،چاپی یه‌که‌م (١٩٩٩) ده‌زگای گوڵان

٦- کوچ سرخ، کۆ چیرۆك، به فارسی، وه‌رگێڕان چاپی یه‌که‌م ١٩٨٧ شاخ

٧- نینا، رۆمان، سابت ره‌حمان، چاپی یه‌که‌م،شاخ،١٩٨٥ چاپی سێیه‌م ٢٠٠٥

٨- نامۆ، رۆمان، ئه‌لبیر کامۆ، چاپی یه‌که‌م، شاخ١٩٨٧چاپی چواره‌م ٢٠٠٩ وه‌شانخانه‌ی سایه،سلێمانی

٩- رێبه‌ر، رۆمان، مه‌هدی حسین، چاپی یه‌که‌م (شاخ) ١٩٨٣، چاپی دووه‌م، ٢٠٠٧

١٠-شکست، رۆمان، ئه‌لکساندەر فه‌دایه‌ف، چاپی شاخ (راه کارگر)، چاپی دووه‌م، ٢٠٠٩ خانه‌ی وه‌رگێڕان.

١١- هاوماڵه‌کان، رۆمان، ئه‌حمه‌د مه‌حمود، چاپی دووه‌م ٢٠٠٠ ده‌زگای گوڵان

١٢ – بێناسنامه‌کان، رۆمان، عه‌زیز نه‌سین، چاپی سێیه‌م ٢٠٠٦

١٣- قوربانی، رۆمان، هیرب میدۆ، چاپی یه‌که‌م ٢٠٠٤ ده‌زگای شه‌فه‌ق

١٤- دووره ولات، رۆمان ع. ڤاسموف، چاپی یه‌که‌م٢٠٠٠ ده‌زگای گوڵان

١٥- ئازادی یا مه‌رگ، رۆمان، کازانتزاکیس، چاپی یه‌که‌م ٢٠٠٣ کتێبخانه‌ی سۆران، چاپی دووه‌م: ٢٠٠٨

١٦- چیرۆکه‌کانی سه‌مه‌دی بیهره‌نگی، چاپی دووه‌م، ٢٠٠٤ کتێبخانه‌ی سۆران هه‌ولێر

١٧- ئامانجی ئه‌ده‌بیات. م. گۆرکی، چاپی شاخ ١٩٨٥

١٨- ئه‌و رۆژه‌ی که ونبووم (کۆمه‌ڵه چیرۆکی بیانی) چاپی یه‌که‌م،٢٠٠٦

١٩- جیٚ پیٚ (کۆمه‌ڵه چیرۆکی فارسی) چاپی یه‌که‌م ٢٠٠٦،نووسه‌رانی که‌رکوك

٢٠- زنده خه‌ون، کۆمه‌ڵه چیرۆك، چیخۆف،چ١،ده‌زگای موکریانی

٢١- چیرۆکستان ،کۆمه‌ڵێك ده‌قورەخنه‌ی جیهانی چ١ ،٢٠٠٥،نووسه‌رانی که‌رکوك

٢٢-دیدارو ده‌ق و ره‌خنه،چ٢٠٠٥،١

٢٣-دیداری چیرۆکڤانی، چ٢٠٠٥،١

٢٤-ئه‌و به‌رخه‌ی که بوو به گورگ ،چ٢٠٠٨،١نووسه‌رانی که‌رکوك

٢٥- میوان، چیرۆك،ئه‌لبێر کامۆ

---

٢٦- مه‌سه‌له‌ی کورد له عێراقدا،عه‌زیز شه‌ریف،چاپی دووه‌م ٢٠٠٥

٢٧- مێژووی ره‌گ و ره‌چه‌ڵه‌کی کورد، ئیحسان نوری پاشا،چ١٩٩٨١،١

٢٨- کورد گه‌لی له خشته‌براوی غه‌در لێکراو، د. کوینته‌ر دیشنه‌ر، چاپی سێیه‌م ٢٠٠٤

٢٩- له مه‌هابادی خوێناوییه‌وه بۆ که‌نارێن ئاراس، نه‌جه‌ف قولی پسییان، چاپی یه‌که‌م ٢٠٠٦

٣٠- کورد له سه‌ده‌ی نۆزده‌وبیسته‌مدا،کریس کۆچرا،چاپی شه‌شه‌م ٢٠١١

٣١ -کورد له ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا،چاپی یه‌که‌م ١٩٩٨

٣٢- چینی کۆن، چ١(  )ده‌زگای موکریانی

---

٣٣- دلێریی خۆراگرتن، ئەشرەفی دەهقانی
٣٤- خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ، مەسعودی ئەحمەد زادە

---

٣٥- ڤنسنت ڤان گوگ، شانۆنامە، باول ئایز لەر
٣٦- بە دوعا شاعیرەکان، شانۆنامە، جەلیل قەیسی (گزنگ ژ:١٢)
٣٧- جولەکەکەی مالْتا، شانۆنامە،کریستۆفەر مالرۆ.
٣٨- دادپەروەران، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ
٣٩- بەد حالْی بوون، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ.
٤٠- چاو بە چاو، شانۆنامە، گەوهەر مراد (غولاّم حسەینی ساعیدی)
٤١- ریچاردی سێیەم، شانۆنامە، شەکسپیر.چاپی یەکەم ٢٠٠٩، بلاّوەخانەی سایە، سلێمانی
٤٢- گەمەی پاشا و وەزیر، شانۆنامە، عەبدوڵلاّئەلبوسێری..

---

٤٣- مندالْە دارینە، چیرۆکی درێژ بۆ مندالاّن.
٤٤- فاشیزم چییە؟ کۆمەڵە چیرۆك بۆ مندالاّن، یەلماز گونای
٤٥- شوانە بچکۆلەکە، چیرۆکێکی درێژی چینی یە بۆ مندالاّن
٤٦- زارۆکستان (چوار شانۆنامە بۆ منالاّن)
٤٧- چەند چیرۆکێك لە ئەفسانەی یونانی کۆنەوە (٢٣ئەفسانە)

---

٤٨- لە گەنجینەی حیکایەتی تورکمانییەوە. (ئەفسانەی ئەسپی ئاشق)چاپی یەکەم٢٠٠٨
٤٩- ئەفسانەێن گریکی و رۆمانی، چاپی یەکەم (٢٠٠٤) کتێبخانەی سۆران، هەولێر
٥٠- ئیلیادە، هۆمیرۆس، چ١،دەزگای سەردەم ٢٠٠٩

---

٥١- گۆڤەنــد و زنــار (فەرهــەنگی فارســی – کــوردی) حەمــە کــەریم عــارف، چ١(٢٠٠٦-٢٠٠٨)دەزگای موکریانی
٥٢-چۆنیەتی فێربوونی زمانی فارسی، چ١، ٢٠٠١

---

٥٣- چرنیشفسکی، فەیلەسوف و زانای گەورەی میللەتی روس
٥٤- چایکۆ فسکی، ژیان و بەرهەمی.
٥٥- ئیدگار ئالین پۆ، ژیان و بەرهەمی.
٥٦- جاك لەندەن، ژیان و بەرهەمی
٥٧- گوگول، نووسەری ریالیست
٥٨- یەڵماز گونای، ژیان و بەرهەمی
٥٩- سادقی هیدایەت، ژیان و بەرهەمی
٦٠- خافروغ لە شیعر دەدویً، ژیان و بەرهەمی

٦١- راگەیاندن لە پەراوێزی دەسەلاتدا (بە شەریکی) چاپی یەکەم (٢٠٠١) دەزگای گولان
٦٢-راگەیاندن لە نێوان حەقیقەت بێژی و عەوام خەلەتێنی دا، حەمە کەریم عارف،چ(١)،٢٠٠٥

٦٣- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە کۆنەوە تا سەدەکانی ناڤین).چاپی یەکەم٢٠٠٨
٦٤- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە سەردەمی رینیسانسەوە تا ئێستا).چاپی یەکەم٢٠٠٨
٦٥- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (ئەدەبیاتی ئینگلیزی زمان- ئەمریکاو ئینگلیستان لە سەرەتاوە تا ئێستا).چاپی یەکەم٢٠٠٨
٦٦- ریالیزمودژە ریالیزم لە ئەدەبیاتدا،سیروس پرهام،چ١،٢٠٠٤،دەزگای سپیرێز
٦٧- قوتابخانە ئەدەبییەکان،رەزا سەید حسەینی، چ١،٢٠٠٦دەزگای موکریانی
٦٨- مێژووی ئەدەبیاتی روسی، سەعیدی نەفیسی
٦٩- لێکدانەوەیەك لەمەڕ نامۆ ، لویس ریی ،چ٢، ٢٠٠٦
٧٠- هونەروژیانی کۆمەلایەتی، بلیخانۆف، چ١(٢٠٠٥)دەزگای موکریانی
٧١- گوزارشتی مۆسیقا،د. فواد زکریا، چ١،یانەی قەلەم ٢٠٠٦
٧٢- رێبازە هونەرییەکانی جیهان
٧٣- پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت،(چ١) ٢٠٠٦
٧٤- دەربارەی شیعروشاعیری، حەمە کەریم عارف، چ١،٢٠٠٧
٧٥- دەربارەی رۆمانو چیرۆك، حەمەکەریم عارف،چ١، ٢٠٠٨
٧٦- مەرگی نووسەرو چەند باسێکی دیکەی ئەدبی-رۆشنبیری،حەمەکەریم عارف،چ١، ٢٠٠٥نووسەرانی کەرکوك
٧٧- ناودارانی ئەدەب، حەمە کەریم عارف، (چ١) دەزگای موکریانی،٢٠٠٩
٧٨- پەیڤستانی من، حەمە کەریم عارف،چاپی یەکەم()
٧٩- پەلکە رەنگینە، حەمە کەریم عارف،چ١، ٢٠٠٤
٨٠- خیانەتی حەلاڵ، حەمە کەریم عارف
٨١-بووکی هەزار زاوا، کۆچیرۆك، بزورگی عەلەوی
٨٢-ئەبوزەر، د.عەلی شەریعەتی
٨٣-ریوایەت، ڕۆمان، بزورگی عەلەوی
٨٤-وقفات فی رحاب الپقافە الکوردیە، حەمە کەریم عارف
٨٥-هەژاران، ڕۆمان، دوستوفسکی
٨٦-دەیڤد کۆپەرفیلد، (رۆمانی کورتکراوە بۆ نەوجەوانان) چارلس دیکنز
٨٧-ئۆدیسە، داستان، هۆمیرۆس
٨٨-ڤل الصوت و قصص اخری، تقدیم و ترجمە جلال زنگابادی
٨٩-شازادە و گەدا، رۆمان، مارك توین

**٩٠-توحفەنمای ئەدەبیاتی جیهانی**

**٩١-سفرەی فەقیران   حەمە کەریم عارف**

**٩٢-باڵندەکەی من    رۆمان، فریبا وفی**

**٩٣- نامەکانی تولستۆی**

**٩٤- جەمیلە، رۆمان    جەنگیز ئایتماتۆف**

**٩٥- حەفتا چیرۆکی چینی بۆ منالأنی کورد**

**٩٦- الرحیل الدامی....تقدیم وترجمە: جلال زنگابادی**

**٩٧- کلۆوانە سوور... کۆچیرۆك بۆ مندالأن**

**٩٨- ئەو پیاوەی کە سێبەری خۆی فرۆشت ..رۆمان..شامیسۆ**

**٩٩- دکتۆر...شانۆنامە...برانسیلاڤ**

**١٠٠- با خەییام باش بناسین /جەلال زەنگابادی**

**١٠١- دۆزەخی پیرۆز، رۆمان ،برهان شاوی**

**١٠٢- من و نەنکم و ئیلاریون و ئیلیکۆ / رۆمان / نودار دومبادزە**

**١٠٣- یادگارییەکانی خانەی مردووان/ دۆستویفسکی**

**١٠٤-مێژووی رۆمانی تورکی**

*** لـە راپەڕینــەوە تـا نهـوو چـالاکانە بەشـداری بزاڤــی ئـەدەبی و رۆشـنبیریی کـوردی دەکـات وبەرهەمی هەمە جۆر (نووسین و ئامادە کردن و وەرگێڕان) بڵاودەکاتەوە..**

*** ئەو بەرهەمانە و زۆری دیکەی ئامادەن بۆ چاپ و چاپکردنەوە و هەر کەس و گروپ و لایـەن و دەزگایەك تەماحی بلأو کردنەوەی هەبن، دەبێ پرس بە نووسەر بکات...**